ناوی: کتێب: فرمێسکی بەفر
نووسەر: عەبدولقادر سەعید
بابەت: ڕۆمان
مۆتیڤی بەرگ:
خاتوو؛ لازۆ عەبدولقادر سەعید (تەمەن ٦ ساڵ)
دیزاینی ناوەرۆک: حیکمەت مەعروف
بەرگ: ئارام عەلی
تایپ: ئالین
نۆبەتی چاپ: یەکەم
چاپخانە: کارۆ
تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١١٦٨) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە.

لەساڵیادی کارەساتی هەڵەبجەدا

ئەم بەرهەمە لەسەر ئەرکی
وەزارەتی شەهیدان و کاروباری ئەنفالکراوەکان
لە چاپ دراوە

**ئەگەر مێژوو وەک چۆن روویداوە بنووسرێتەوە،**
**ئاخۆ دەبێت نەوەکانی ئاینده ..**
**چۆن یادمان بکەنەوە؟!**

پێشەکی

## عەلی .. رۆحی سەردەمێکی کوردییانە

خەبات عەبدوڵڵا

(١)

سالآنێکی دوورودرێژە، ئێمە تەنها لەمیانەی فۆتۆ و ئینشاوە هەڵەبجەمان پێدەگات. ڕاستییەکەی کە باسی هەڵەبجە دەکرێت ڕاستەوخۆ وێنەی ئەو قوربانیانەمان دێنەوە بەرچاو کە لە هەمان کاتدا مێژووی ڕودانی کۆستە گەورەکەیە. هاوتەریب لەگەڵ ئەم پیشاندانە بەردەوامەی وێنەکانی هەڵەبجە، گوتارێکی ئینشاییش ئامادەیە کە هەڵەبجەمان تەنها لە یەک کایەدا بۆ کورت دەکاتەوە؛ ئەویش کایەی سیاسەت و واوەتریش کایەیەکی حیزبییە کە جگە لە گوتاری قوربانیی چی دیمان پێناڵێت.

بەکارهێنانی ئەم مێژووە وێنەییە لەلایەن گوتاری باوەوە، بەدبەکارهێنانێکی یەکجار وێرانکەر بووە.

قسەی پێناوێت، لەدەرەوەی دەقی نوسراو و تەنانەت کردەی شۆڕشگێڕانەشدا، وێنەکانی هەڵەبجە بوو بە ئامڕازی چوونە ناوەوەی نەتەوەیەک بۆ ناو مێژوو، بەلآم بەکارهێنانی یەکبینەی وێنەکانی هەڵەبجە بەتەنیشت گوتاری سیاسی باوەوە بەمەبەستی یادهێنانەوە و ئنجا پیشاندانی کۆستێکی لەو جۆرە هەر

بەتەنها لەمیانەی سیاسەتەوە، ئیتر وێنەکانیشی وردە وردە گۆڕیوە بە کەرەستەی بێ گیان. ئاخر وێنە بۆ خۆی کەرەستەیەکی گرنگی (گەیاندن)ە لەدەرەوەی زمانی ئاخاوتن، بۆیە کاتێک گوتاری سیاسی ئینشایی دەبێتە زمانحاڵی ئەم وێنانە، وێنەکان مێژووی خۆیان لەدەستدەدەن و دەبنە خاوەنی مێژوویەکی نوێ. بەواتایەکی دی؛ ئێمە ئێستا ئیتر خاوەنی کۆمەڵێک وێنە و یادەوەریین کە مەرج نیە خاوەن هەمان ئەو حیکایەتانە بن کە وێنەکان خۆیان لەڕاستیدا هەڵگرین.

(٢)

لەمەڕ هەڵەبجە ئێمە تا نها هەر بەو دەقانە ئاشنا ین کە باس لە سەفەر و سەرهەڵگرتنی هەڵەبجەییەکان دەکەن، چیرۆکی راکردن و هەوڵی دواساتەکانی خۆڕزگارکردنی ئەندامە پەڕاگەندەکانی ئەو خێزانانەی کە دۆزەخی بەعسیی تەنانەت مافی پێکەوەمردنیشی لێ زەوت کردن. ئێمە تا ئێستا تەنها بەو یادەوەریانە ئاشناین کە لە بریتی بەرامەی هەناری سالح خانی و لاڕەشەی ناو باخەکانی گوڵان و سازان و عەبابەیلێ، هەمووی بۆنی میوەی گەنیویان لێ هەڵدەستێت. چارەکە سەدەیەکە و ئێمە لە هەڵەبجە لەگەڵ ئەو کاراکتەرانەدا دەبینە هاوەڵ کە پشتیان لە دۆزەخەکەی هەڵەبجە و (ئاوڕ بۆ پێشەوە)[1] دەدەنەوە!

عەیامێکی دوورودرێژە هەڵەبجە هەر تەنها لەمیانەی ئەو جەستە راکشاوانەی کوچە و کۆڵانەکانی کانی قوڵکە و پیرمحەمەد و مۆردانە و کانی عاشقانەوە دەبینین کە هەر دەڵێیت خەڵکەکەی بە چاوی والاوە خەوتون.

لەڕاستیدا قوربانییەکانی هەڵەبجە لە قوربانییەکانی تری دەستی فاشیزمی بەعسیی ناچن، ئەمان پێش کوشتنیان چاویان کلۆم ناکرێن و روخساریان ناشاردرێنەوە، ئاخر جەللادی بەعسیی پێش کوشتنی فیزیکی قوربانییەکانی، دەبوا روخساری قوربانییەکانی بسڕێتەوە. بە واتایەکی دی؛ ئەوە جەللادی بەعسی بوو کە نەیدەتوانی قوربانییەکانی بە چاوی کراوەوە ببینێت.

"جەللاد بۆیە دەمانکوژێت بۆ ئەوەی چی دی روخسارمان نەبینێت، چونکە روخسار نیشانەی بوونی ئینسانیانەی ئێمەیە لە دنیادا (...)، جەللاد لەم پرۆسەی تەلاقدانی جیهان و دەستهەڵگرتنە لە ئینسانییەتی خۆی، پێویستییەکی زۆری بەوە هەیە ئەوەی دەیکوژێت روخساری نەبێت و سیمای ئینسانیانەی شێوێنرابێت. چونکە وەکو فەیلەسوفی لیتوانیایی ئیمانوێل لیڤیناس دەڵێت: روخسار هەمیشە هەڵگری پەیامێکە کە قەتڵ و تیرۆرمان لێ قەدەغە دەکات، بینینی هەموو روخسارێک بیرهاتنەوەی ئەو راستییەیە کە پێمان دەڵێت تۆ بۆت نیە کەس بکوژیت"[٢].

بەعس لە هەڵەبجە دەستی نەدەگەیشتە قوربانییەکانی، نەیدەتوانی قۆڵبەستیان بکات و چاو و روخساریان بشارێتەوە، بەپێچەوانەی ئەنفالەوە، بەعس نەیتوانی روخساری قوربانییەکانی بۆ هەتاهەتایە بشارێتەوە و گۆڕغەریبیان بکات، بۆیە بۆ ناشرینکردنی روخسار و دەموچاوی قوربانییەکانی، بەعسییەکان لە هەڵەبجە دەرگای دۆزەخێکیان بە رووی هەڵەبجەییەکاندا کردەوە کە سەرەڕای کوشتنی بەسۆ، روخساری هەمووشیانی سوتاند.

(٣)

شانزەی سێ کۆستێکی نەتەوەییە. ئامانج لەم تاوانە هەر بەتەنها کوشتن و قڕکردنی هەڵەبجەییەکان نەبوو، شانزەی سێ بەهەمان شێوەی تاوانی ئەنفال، جگە لە قڕکردن، تێکشکانی غروری کوردیی بوو، غروری نەتەوەیەک جیاواز لە نەتەوەی سەردەست لە عێراقدا.

فاشیزمی بەعسیی هەر بەتەنها کوشتنی فیزیکی ئینسانی کوردی لا مەبەست نەبوو، بەعس کوشتنی کوردی دەکردە ماددەیەکی سیمبۆلیک و پاساوی ئایینی بۆ دەهێنایەوە. بەعس پاش کوشتنیش دەستی لە قوربانییەکان هەڵنەدەگرت و دەیناردنە دۆزەخ!

لە شاڵاوی رفاندنی هەزاران گەنج و پیاوی بارزانی لە ساڵی ١٩٨٣دا، کەچی تەنها دوو مانگ دوای ئەو

تاوانە، سەدام حسێن لە وەڵامی میدیاکاراندا وتی: "ئەوانە بەتوندی سزای خۆیان وەرگرت و فڕێدرانە دۆزەخەوە"[٣].

بەرامبەر بە کورد سەدام حسێن خۆی بە پێغەمبەر و حیزبی بەعس بە ئیسلام و سوپاکەشی بە لەشکری سەردەمی فتوحات دەچواند. لەخۆڕا نەبوو، قەتڵوعامی کورد لە ١٩٨٨دا بەناوی سورەتی ئەنفالەوە ناونرا.

هەر بۆیە قسەکردن لە هەڵەبجە تەنها لە میانەی ئینشای بارگاوی بە سیاسەت، هەڵەیەکی کوشندە و خەتایەکی یەکجار گەورەیە.

(٤)

ئەو دەمەی عەرەبەکان لە جەنگی شەش رۆژەدا دژ بە ئیسرائیل دوچاری شکستی گەورە دەبن و روبەرێکی گەورەی خاکی عەرەب و هەردوو بەشەکەی خاکی فەلەستین دەدۆڕێنن، ئەدەبی بەرگری عەرەبی سەرگەرمی داتاشینی چەندین پاڵەوانی وەهمی بوو، ئەو پاڵەوانانەی کە تەنها لە میانەی خەیاڵی شاعیرانەدا دەیانتوانی دەستەوئێخە روبەڕوی داگیرکەری ئیسرائیل ببنەوە و جولەکە شاربەدەر بکەن، ئا لەو دەمەدا ئیمیل حەبیبی لە میانەی رۆمانێکەوە بەناونیشانی (سداسیة الأيام الستة)، دور لە جۆش و خرۆشی شۆڕشگێڕانە و لەجیاتی خولقاندنی پاڵەوانی ئەفسانەیی، لە شەش تابلۆدا شەش چیرۆکی جیاوازی گەڕانەوە و بەیەکدی شادبونەوەی

خێزانە فەلەستینییەکانمان پاش لەیەکدان و داگیرکردنی هەردوو بەشەکەی خاکی فەلەستین بۆ دەکاتە دەقێکی هونەریی، چیرۆکی سەفەرێکی نوێ لەسایەی سەردەمێکی نوێ کە سەردەمی داگیرکاری ئیسرائیلی و شکستی عەرەبیە.

ئیمیل حەبیبی هەر بەوەوە ناوەستێت، بۆ بەدەقکردنی ژیانی نوێی فەلەستینییەکان لە پاش شکست و لەسایەی داگیرکەردا، لە رۆمانێکی تریدا بەناونیشانی (الوقائع الغريبة في أختفاء سعيد أبي النحس المتشائل)[٤] ، کە دەکرێت بە یەکێک لە شاکارەکانی ئەدەبی عەرەبی دابنرێت، لەڕێی ئەدەبی گاڵتەجاڕییەوە، پەنا دەباتە بەر پاڵەوانێکی ئاسایی، پاڵەوانێک کە لە کولتوری ئەدەبی بەرگریدا بە پاڵەوانی سلبی ناسراوە. پاڵەوانەکەی حەبیبی هاوڵاتییەکی فەلەستینیی عەوام و کاراکتەرێکی زەلیل و رۆحێکی تێکشکاوە. سەرەڕای ملدانی بۆ ئەوەی ببێتە هاوڵاتییەکی باشی ناو دەوڵەتە نوێیەکە کە ئیسرائیلە، بەڵام دواجار روبەروی کارەسات دەبێتەوە، کارەساتی لەدەستدانی ئەوەی وەکو ئینسان بژی.

بەپێچەوانەی چالاکە سیاسییەکانی سەردەمی خۆی، ئیمیل حەبیبی سەرەڕای ئەوەی هەر لەسەرەتای لاوێتیەوە تێکەڵی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بووە، بەڵام لەبریتی پەنابردن بۆ دروشم و ئینشا، لەڕێی ئەدەبەوە و لەبریتی خوڵقاندنی پاڵەوانی درۆینە، لەڕێی کاراکتەری ئاسایی هەڵقوڵاوی ناو میللەتەکەیەوە، توانی رستێک لە جومگە

تراژیدییەکانی مێژووی نەتەوەکەی لەمیانەی ئەدەبەوە بکاتە چەند دەقێکی هونەریی نەمر.

(٥)

عەبدولقادر سەعید لە رۆمانی فرمێسکی بەفردا، لەڕێی خەمی گەڕان بە شوێن دایک و حەزی ئاشنابوونەوە بەو بوونەوەرەی کە ئینسان لە حزوریدا دەگەڕێتەوە بۆ منالّی، لەگەڵ عەلیدا سەفەرمان پێ دەکات. بەڵام سەفەری پالّەوانەکەی عەبدولقادر سەفەری سەرهەڵگرتن نیە، سەفەری گەڕانەوە و گەڕانە بەشوێن ئولفەتێکی ونبوودا. عەلی پالّەوانێکی ئەفسانەیی نیە، ئەگەرچی چیرۆکی عەلی سەرگوزشتەیەکی راستینەی هەڵەبجەیە، بەڵام عەلی هەڵەبجەیی هەمان پالّەوانەکەی ناو رۆمانی فرمێسکی بەفر نیە. عەلییەکەی عەبدولقادر هەروەکو چۆن گوزارەیە لە رۆحی سەردەمێکی کوردییانە، لەهەمان کاتدا گەڕانەوەی روخسارێکی نوێیە، روخساری ئەو گەنجەی پاش ئەوەی جەللادی بەعسی نەیتوانی بیکاتە قوربانی، دوور دوور فڕێی دایە دەرەوەی پانتاییەکانی خۆی. ئاخر جەللادی بەعسی نەیدەویست کەسی دی جگە لە قوربانی، لە تەنیشتییەوە بژی. سەفەری عەلی بە دیوێکی تردا، سەفەری بەجێهێشتنی پانتاییەکانی جەللاد و دەستبەردانە لە بوون بە قوربانی.

گەڕانەوەی عەلی وەکو گەنجێکی خاوەن پرسیار، هیچ گومانێک لەوەدا ناهێڵێتەوە کە سەرەڕای خنکاندنی هەڵەبجە، بەڵام هێشتا هەڵەبجە شوێنی ئەو نەوەیەیە کە لە دەمەدەمی بەهاری هەشتاوهەشتدا دور لە باوەشی دایک، شوێنغەریب کران.

ڕۆمانی فرمێسکی بەفر هەروەکو چۆن خەمی نەوەیەکی بێ نەوامان بۆ دەگێڕێتەوە، دواجار سەفەرێکیشە بەناو ئەو کۆستەی کە پێی دەوترێت شانزەی سێ.

***

پەراوێزەکان:


١. تەیب جەبار: ئەو شیعرانەی ئاوڕ بۆ پێشەوە دەدەن، دیوانەشیعر، ٢٠١١، سلێمانی.

٢. ڕێبوار سیوەیلی: نەتەوە و حەکایەت، ل ٤٣٩، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٢.

٣. خەبات عەبدوڵا: بنەما تیۆریەکانی جوگرافیای عەسکەریی کوردستانی باشور، ل ٢٧٤، چاپخانەی رون، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٤. امیل حبیبی: الوقائع الغريبة في اختفاء سعيد ابي النحس المتشائل، دار ابن خلدون، بیروت، ١٩٧٤.

بەرەبەیانی شانزەی سێ دایکم مرد.

خـــــەڵکی گـــــەڕەک تەرمەکـــــەیان بـــــەرەو گۆڕسـتانەکەی نزیـک مـاڵی خۆمـان خـستبووە سـەر شانیان. دەیان کەس بەشوێن تەرمەکەیەوە لەسـەرخۆ دەڕۆیـــــشتن. هەنـــــدێکیان بێـــــدەنگ و غـــــەمبار، هەندێکیـشیان تـەنها لـەژێر لێـوەوە ورتـەورتیان لێـوە دەهـــات، کـــە نەمـــدەزانی چیـــدەڵێن. ئـــەوانی تریـــش زۆرینـەی خەڵکەکـەیان پێکدەهێنا سـەرگەرمی قسـە و بـاس و گیروگرفتـەکانی ڕۆژانـەی خۆیـان بـوون. مـن ئاگرێـک لـە ناخمـدا هەڵایـسابوو نێڵـەنێڵ دەسـووتا. هەنـدێ لـە هاوڕێکـانم دەستیاندەخـستە سـەرشـانم و هەندێکی دیکەیان لەبەر بێهێزیم لەپشتەوە بەهەردوو دەسـتیان کەمـەریان دەگـرتم، نـەوەکو لـەتر بـدەمو بکەوم. هەریەکێکیشیان بەشێوەی جیاجیا دڵخۆشیان دەدامـــەوە، بـــەڵام مـــن هـــەر کوڵـــی گریانەکـــەم

دانەدەمرکایەوە ... گۆڕستانەکە ڕووبەرێکی فراونی داگیرکردبوو. بە جۆرەها درەخت ڕازێنرابۆوە، هەر درەختەی مانایەکی تایبەت و هێمایەکی جیاواز بوون بۆ ئەوانەی لەسەر گۆڕی ئازیزەکانیان ناشتویانن. هەر گۆڕێک ناو و نازناو و مێژووی لەدایکبوون و مردنیشی لەسەر تۆمار کرابوو. بە جۆرێک مرۆڤ حەزی دەکرد یەک بەیەک نووسراوی سەرکێلی گۆڕەکان بخوێنێتەوەو هۆکاری مردنەکانیشیان بزانێت. دەیان جۆر گوڵی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر گۆڕو دەوروبەرەکانیان نێژرابوون. بە تایبەت بەهاری ئەو ساڵە چەند هەنگاوێ پێش وادەی خۆی کەوتبوو. ئەگەرچی بینینی گوڵی ڕەش لەوێدا دڵی ئامادەبووانیان تەنگتر دەکرد، بەڵام ئەمەش پاساوی خۆی هەبوو کە ئازیزەکانیان لەسەر گۆڕەکانیان ناشتبوویانن. بۆنی گوڵەکان کە لەبۆنی دەیان جۆر عەتری تێکەڵکراو دەچوو، وای لێدەکردیت زیاتر بمێنێتەوەو جێیان نەهێڵیت. بەتایبەتی کاتێک دەتبینی چەندین پەپوولەی باڵ نەخشینی ڕەنگاو ڕەنگ و سەدان زیندەوەری باڵگرتووی جۆراوجۆر دەهاتن و دەچوون. پۆل پۆلو تاک تاک باڵندەی ڕەنگاو ڕەنگ دەهاتنو دەچوونو بە جریوەو قریوە خۆشەکانیان

ئاهـــەنگێکی وایـــان ســـازکردبوو کـــە هـــەر کەســـەی بـــەگوێرەی ئەوســـاتە دەروونـــیەی کەتێیـــدا دەژی بیگونجێـنێ. ئەگـەرچی ئـەوێ گوڕسـتانێکی بێـدەنگو هێمن بوو، بەڵام بەوەی ژیان بـەجۆرێکی تـر ئاوەدان بـوو، هەسـتت دەکـرد ژیـان بەگشت جوانییەکانییـەوە دووبارە دەبێتەوە، وەلێ بەشێوەیەکی جیاوازتر. بەناو گۆڕستانەکەدا دەڕویشتین، دەنگی مەلاکە لەپێشەوەی خەڵکەکـەوە دەگەیـشتە هـەمووان. کـە بەشـێوەیەکی قەتارەیی بەنێو کێلەکاندا رێیان دەکرد، ئەو گۆڕەی بۆ دایکـــم ئامـــادەکرابوو دەکەوتـــە بەشـــی ئەوســـەری گۆڕســـتانەکەوە. گۆڕێکـــی قـــوڵو تـــاک و تـــەنیا، پێچەوانـەی سـاڵانی زووی جەنگـە خوێناویەکـە، کـە ماوەی هەشت ساڵی خایاندوو لەهـەموو گۆڕستانێکدا هەمیـشە دەیـان گـۆڕ ئامـادە کرابـوون بـۆ ناشـتنی سـەربازە کوژراوەکـانی بـەرەی جـەنگ، کـە ڕۆژانـە دەیان سەربازی کوژراو بەسەر گۆڕستانی شارەکاندا دابـەش دەکـران. مەلاکـە بـەقامکە باریـک و درێـژەکەی شـوێنی دانـانی تەرمەکـەی دایکمـی دەستنیـشان کـرد. تادەهــات خەڵــکەکە لە تەنیـشت گۆڕەهەڵکەنـدراوەکە کۆدەبــوونەوەو چــوار دەوری گۆڕەکــەیان دەتــەنی. عەمامـەی سـەری مەلاکـە لـەنێوان خەڵکەکـەدا سـپی

دەچووەوە کە لەناوەڕاستدا بەچیچکانەوە دانیشتبوو. هەوڵمدا بچمە تەنیشت دایکمەوە، خەڵکەکە ڕێیان بۆ چۆڵکردم. لەتەنیشت سەریەوە کوشکەڵەم کرد. دەستم بەبەشی سەرەوەی ئەو جاجمەدا دەهێنا کە درابوو بەسەر تەرمەکەیدا. لەگەڵ ئەوەی دڵتەنگیەکەم ڕێی بیرکردنەوەی قووڵی لێدەگرتم، بەڵام بیرەوەری ئەو هەموو ساڵە زۆرانەم لەگەڵ ئەودا ژیانی خۆم دەهاتەوە پێش چاو. حەزم دەکرد سوچی سەرەوەی جاجمەکە لابدەمو بۆ دوایین جار ڕووخساری ببینمو دەست بخەمە ناو دەستە سپی و لەرزۆکەکانیەوە، کە پیریەتی بڕستی لێ بڕیبوون. بۆ دوایین جار تێر لە چاوە پڕ میهرەبانییەکانی بڕوانم، ئەگەرچی دڵنیاش بووم چاوەکانی بۆ هەمیشە لێک نابوون. خەڵکەکە دەستیان دەگرتمو نەیاندەهێشت، بەڵام نەمدەزانی بۆچی. مەلاکە فەرمانی کرد جاجمەکەی لەسەر لابدەن. هەروایان کرد، هەموو هەستانە سەرپێ، کەس نەما بەدانیشتنەوە هەموو لەدایکم ڕادەمان، وەک ئەوەی بیر لەشتێ بکەنەوە کە نازانن‌و دەیانەوێ چۆنێتی لەگۆڕنانی کەسانی تر بزانن. دوو گەنجی بەهێز دایکمیان بەبەرگە خامە سپییەکەوە بۆ ناو گۆڕە تەنگو شێدارەکە داهێڵایە خوارەوە، دڵم

هێنــدەی تــر گوشــرا. گریــانم نــەما، فرمێــسکەکانم وشکاییان هـاتو تـەنها هەنسکم هەڵدەداو هیچی تـر. هاوڕێکـانم هاتنـە تەنیـشتمەوە، دڵنـەواییان دەکـردم. لەگـەڵ هەڵـدانی یەکـەم خاکـەنازە گڵدا موچوڕکەیـەک لەتەوقی سەرمەوە هاتو لەنووکی پەنجەکانی پێمـەوە دەچــووە دەرەوە. خەڵکەکــە ســەری گۆڕەکــەیان دادەپۆشــی بــەڕێزەوە باســیان لــەدایکم دەکــرد. بەبـەزەییو سۆزیـشەوە لـەمنیان دەڕوانـی. ئەگەرچـی زۆرکەسـیش لـەئامادەبوان چیرۆکـی منیـان نـەدەزانی، بەڵام بە هۆی پەرێشانیی حاڵی منو سۆزی ئەوانـەی چیرۆکــی منیــان دەزانــی ئــەوانی تــریش بەهــەمان سۆزەوە لێیان دەڕوانیم. دوای ئـەوەی مەلاکـە هەندێ چیرۆکـی کـورت کورتـی دەربـارەی چاکـەو خراپـەو ژیـانو مـردن گێڕایـەوە. وەک پاککردنـەوەی ڕۆحـی ئامـادەبووان کـە بـەهێمنی گوێیـان گرتبـوو، بـە هـەمان هێمنییـەوە هەسـتانە سـەرپێو نیگـەرانیی خۆیـان بـۆ دەربـڕیم و یـەک لـەدوای یـەک ماڵئاواییـان دەکـردوو بــەجێیان دەهێــشتم. منیــش هــەر دوابــەدوای ئــەوان هەسـتام بڕۆمو گۆڕەکـەی دایکـم جێ بێڵـم. نەمتوانـی جارێکی تر هەوڵمدا هەر نەمتوانی، پێیەکانم تـا دەهـات قورســـتر دەبـــوون. ئەگـــەرچی دەمزانـــی مـــردن

چارەنووســـێکی سروشـــتیی یـــەک لـــەدوای یەکـــی مرۆڤەکانـــە، بـــەڵام گەڕانـــەوە بـــۆماڵـــە تەنیاکـــەم، لـەدڵنیایی‌و لـە جێهێشتنی گۆڕەکـەی دایکـم پەشـیمانی دەکردمەوە. دەمزانی (تـەنیایی گۆڕێکی تەنگە) تەنگتر لـەگۆڕە تەنیاکـەی دایکـم. ئـەو ڕۆژەشـم هـەر لەگـەڵ دایکمدا بەسەر برد. من زۆر دوام‌و ئـەو هـەر بێدەنگ، مـن زۆر بـانگم کـرد ئـەو بـێ وەڵام. پرسـیارم لـەزۆر شت دەکرد. دەمپرسی دایکە گیان ناترسیت؟ تینوت نییە؟ دایە ئەی ناتەوێت گوێ لـەدواین ئەندێشـەی مـن بگریت؟ دەزانی چەندە سەرسامم بەکاتی گیانەڵاکەت؟! کە چاوەکانت تێ بڕیبووم‌و هەر بە چاو پێت ئەووتم؛ عەلی کوڕە تاقانەکەم مەگری. من دەچم بۆ ئـەوێ، بـۆ لای گـــشت خێزانـــە ژەهربـــاران کراوەکـــەت. لـــەوێ چیرۆکی تۆیان بۆ دەگێڕمەوە، باسی هەموو شتێکیان بۆ دەکەم. هـەموو ئـەو جوان خاسیانەت باس ئەکـەم کە زۆر جار ئێواران ژنێکی سـەرگەردان، دێوەرەیەک یان منداڵە بێ نەواکانت لەگەڵ خۆتدا دەهێنایە ماڵـەوە و پێشت دەووتم: دایـەگیان ئەمشـەو میوانێکمـان هەیـە ڕەنگە ئەو برا بچوکەکـەم، یـان خوشکە ناوەنجیەکـەم، یان دایکە چاوەڕوانەکەم یاخود ڕەنگە باوکم بێت. کە لە کارەساتی ژەهر بارانکردنی شارەکەماندا ون بون‌و

هیچ دەربارەی چارەنووسیان نازانم. دڵ لە دڵ نەدەی دایــە گیــان هــەژاران لەهــەر شــوێنێک بــن ئاســمان پێخــەفو زەوی ڕاخــەری خۆیانــە، ئەمــشەو میوانــی ئێمەنو دەبێ بـەدڵ لەگەڵماندا پێبکـەنن. چیرۆکی زۆر درێژترم بۆ دەگێڕایەوە ئەو هـەر بێدەنگ بـوو. منیش ئەمدایە قوڵپی گریانو خـەمی دووری دایکم دەبوون بە فرمێسـک و هـۆن هـۆن بە چاوەکانمـادا دەهــاتنە خوارەوە. بەبیرەوەرییە شیرینەکانی دایکمەوە خەریک بووم. وردە وردە هەستم دەکرد مردنی ئەو دەبێ بـە حەقیقـەتێکی تـاڵ. لەچەشـنی ژەهـری مـار بـەڵام هـەر دەبــێ بیچــێژم. ئــەو ژەهــرەی کــە نــازانم لــەدوای خواردنـەوەی دەمکـوژێ یـان دەژیـم. هەسـتم دەکـرد تـەنیایم دەبـێ بەچارەنوسـێکی ئاشـکراو ڕونو دەبـێ خـۆم لەگەڵیـدا بگـونجێنم و بڕیـاری ژیـانی لەگەڵـدا یـەکلایی بکەمـەوە. هەسـتامە سـەرپێو هەندێ بـەردی ئــــەو دەورو بــــەرەم کۆکــــردەوەو بــــەچواردەوری گۆڕکــەی دایکمــدا دامنــان. وەک ئــەوەی خەریکــی پاراستنی خۆشەویستی دایکم بـم. نـازانم بۆ وامکـرد. بەڵام دەمزانی دەبێ شتێ بکەم، هەرشتێ کە نیشانەی ڕێـزو خۆشەویـستیم بـێ بـۆ ئـەو، ئینجـا جـێی بێڵـم. خەریک بوو درەنگ ببێ، چونکە کات جێی هێشتبووم.

وەک جێهێــشتنی هاوڕێیــەکی بــێ وەفــا لەکاتــی لێقــەومان‌و ســەرگەردانیدا. بــە تــەنها درەختــە بــاڵا بــەرزەکان‌و قۆپــەنی گوڵــە ڕەنگاوڕەنگــەکان‌و باڵنــدە خۆشــخوانەکان نــەبێت. جــارێکی تــر هەســتم بــەژیان کردەوە، لەوە تێگەیشتم دوای مردنی دایکە هاجەرم هێشتا ژیان بەهەموو مەرگەسات‌و جوانیەکانیەوە هەر بەردەوامە. .

***

گەیشتمە ماڵەوە. ئەمجارە کەس دەرگای لێنەکردمەوە. دەمزانی ئەو لەوێ نیە، لەشوێنێکی تاریک‌و نوتەکدایە. هەر لەجەرەسی دەرگاکەم ئەداو کەس وەڵامی نە ئەدامەوە. دەستم کرد بەگیرفانەکانمدا کلیلی دەرگای ماڵە تەنیاکەم دەربهێنم نەمدۆزیەوە. هەموو گیرفانەکانی خۆم گەڕام تەنانەت هەردوو تاکە پێڵاوەکانی خۆم داکەند. زۆر گەڕام نەمدۆزیەوە. ویستم بگەڕێمەوە بۆلای دایکم، تادەگەمە لای ئەو بەشەقامەکەدا بچمەوەو گۆڕستانەکەش بگەڕێم، یان هەرهیچ نەبێت وەکو هەموو جارێک کەوا ڕاهاتبووم، کە ئاستەنگێکم بۆ پێش هاتبێ، پەنام دەبردە لای ئەوو دەمپرسی؛ دایکە گیان دەبێت چی بکەم؟ چۆن چۆنی ڕزگارم بێ لەم ئاستەنگ‌و هەڵدێرە؟ لەوێش لێی بپرسم کلیلەکانم چیان لێ بەسەرهات! لە کوێ جێم هێشتن؟ هەر وەکو

بەهانەیەکیش بچمەوە لای بیرەوەریەکانی ئەو وەسەر لە نویٚ تێهەڵچمەوە. هەنگاوم هەڵهێنا وەک ئەوەی دەمویست وابکەم. لەناکاو لەزرەی کلیلەکانی خۆم ئاگادار بوومەوە کە لەنێوان پەنجەکانی دەستە چەپمدا جۆلانەیان دەکردو پێکەوە دەنووسانەوە. هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، لەبەر خۆمەوە وتم ئای دایە گیان مردنی تۆ هەموو شتێکی لەبیر بردومەتەوە تەنها خۆشەویستی تۆ نەبێت. بەپرتاو دەرگاکەم کردەوە، سەرەتا چوومە ژورەکەی دایکم بۆنم بەهەموو ژوورەکەوە کرد. بەتایبەتی سەرپۆش و تەزبیحە درێژە بەجێماوەکەی. هێشتا تێرنەببووم لە بۆنی یادگارو بیرەوەریە شیرینەکانی ئەو. دەرگای ژوورە داخراوەکەی خۆمم کردەوە، چاوەکانم چوونە سەر تابلۆ هەڵواسراوەکەی سەرو چرپا ئاسنینەکەی خۆم. نەمزانی سەرەتا لە کوێوە دەست بکەم بەسەیرکردنی تابلۆکە. وەک بینەرێکی ناشی کە نازانێ جوانیی تابلۆیەک لەکوێدایەو ناشزانێ نهێنی جوانییەکان لەیەک جیابکاتەوە، هەر لە تابلۆکەم دەڕوانی، کە تابلۆی شارێک بوو هەموو مرۆڤەکانی تیادا مردبوون. هەورێکی سپی بە سەر شارەکەوە ڕاوەستابوو کە تنۆک تنۆک تورەیی لێ دەباری.

ئەگەرچی هێشتا بۆنی ژیانی لێنەبڕابوو. ئەو شارەی کە بێگومان بووم ڕۆژێ لە ڕۆژان شاری گاگۆڵکێو سەرەتای ژیانی من بووە. ساتەکانی دوای مردنی دایکم سەختتر دەبینی لەچاو ئەو تابلۆیەی کە چاوەکانم پێی ڕاهاتبوون، بەڵام دواتر زۆر نهێنی ترم دۆزیەوە لەو تابلۆیەدا، کە پێشتر چاوەکانم نەیان توانیبوو بیان بینێو هەستیشم بەو هەموو نهێنییە شاراوانە نەکردبوو لەتابلۆکەدا دڵیان دەکردم بە تنۆکێک ئاو. هەستم بەو ڕاستییەش کرد کە بۆچی ئەم شارە بێ چەکو جوانیی پەروەرە کراوە بە وێرانەخاک، هەرچی زیندەوەری ئاسمان و سەرزەویشی هەیە ژەهرباران کراون. چومە بەردەم کتێبخانەکەم، دیوانە شیعرییەکەی حافزی شیرازیم هەڵگرت، کەلەپێشەوەی کتێبخانەکەمدا دامنابوو، تا هەمیشە لەپێش چاوم بێت. ماچم کردو توند بەسنگمەوە نوساند، هەروەکو بۆنی سۆزی دایکایەتی بکەم. چونکە چەند ساڵێک لەمەوبەر دایکە هاجەرم بەبۆنەی هاتنی جەژنی نەورۆزەوە پێشکەشی کردبووم. کە دەیزانی دڵم بەو شیعرە غەمگین و بەسۆزانەی ئەو دەکرێتەوە. هەمان دیوانە شیعریش بوو هانیدام فێری زمانی دایکم ببم، کە بەداخەوە

نــازانم نــاوی چیبــوو. ئەو زمــانەی ڕۆژگــار چەنــد وشەیەک زیاتر نەبێت هەمووی بیر بردبومەوە. دیوانە شیعرییەکەی حافزی شیرازی بەهەردو زمانی فارسی و کــوردی چــاپکرابو کە مامۆســتا حەقیقــی لەزمانــی فارســییەوە وەریگــێڕابوو بــۆ ســەر زمــانی کــوردی. ئەگەرچــی زۆر درەنــگ بــوو بــۆ فــێربوونم، وەلــی ئەندێشە قوڵەکانی من و هاوکاری نەوەی ئەو کوردە شۆڕشگێڕانەی پاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لەساڵی ١٩٧٥ دا لەبەر دڕنــدایەتی ڕژێــم دژی گەلــی کــورد نەیانــدەتوانی بــگەڕێنەوە زێــدی خۆیــان. لەئاوارەیــدا مــابونەوەو لەو شــارەدا نیــشتەجێ ببــون. لەڕێــی ئەوانیــشەوە دەیــان کتێــبی شــیعر و چــیرۆک و بەســـەرهاتی ســـەر سوڕهێنەریـــشم دەســـتکەوت دەمخوێندنەوەو زۆرجاریش لەکەشکۆڵە تایبەتیەکەمدا دەمنوســینەوە تــا بەتەواوەتــی فــێری خوێنــدنەوەو نوسینیان ببم. تەنیایی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وەک تۆڕی جاڵجاڵۆکە چواردەوری دەتەنیم. بەجۆرێک بەیانیان کــە دەچوومــە ســەر کــار هەســتم بــە تارمایــی جاڵجاڵۆکەکــان دەکــرد، کــە لەســەر دەرگــاو بنمیــچ و هــەموو جێیــەکی ماڵەکەمــدا ســێبەرەکانیان دەهــاتن و دەچــوون. هــەرکاتێکیش لــە کارەکــەم دەگەڕامــەوە،

بەئاشـــکرا دەمبینیـــن دەرگاکـــەم لـــێ دەتـــەنن و ڕێـــی چوونـــە ژوورەوەم لـــێ دەگـــرن. ناچـــار دەکەوتمـــە پساندنی پەتە سفتو ڕایەڵە پێچاو پێچەکانیان، بەڵام لەهەموو لایەکەوە بەسەدان جاڵجاڵۆکەی هارو هاج لە جۆری گەورەو بچووک و هـەوڵی چنینی دەرگاکەیان دەدایەوە. دیسان بە ماندووبوونێکی زۆر ڕایەڵەکانیانم دەپساندەوە و دەچوومە ژوورەوە، ئەو ڕۆژانەشی کە لەکارەکـەم دوا دەکـەوتمو درەنـگ دەگەڕامـەوە ئـەوا ڕایەڵـــە چڕەکـــانی ئـــەوانم پـــێ نەدەپـــسێندراو لـــەتاو ماندوویەتی هـەر لەسـەر شـەقامە تاریکەکە تا بەیانی دەمامـەوە و لـەوێ ڕۆژم دەکـردەوە. بـۆیە بڕیارمـدا لەوەولا کە چوومە دەرەوە دەرگەی سەرەکیماڵەکەم کلۆم نەدەم تەنها ژوورەکەی خۆم نەبێت کە مەترسی چنینی کەمترەو پساندنی تاڵەئاڵۆزەکانیشی ساناترن. چەند مانگێکم بەم جۆرە گوزەراند. ئەگەرچی ڕۆژانە ســەرم لەگۆڕەکـــەی دایکـــم دەدا، بـــەڵام لـــە ترســـی جاڵجاڵۆکەکانو هـەموو ئـەونهێنیانەی لـە ژوورەکەمدا کـــەبۆم نەدەکرانـــەوە هـــەر زوو دەگەڕامـــەوە و زۆر لـــەوێ نەدەمامـــەوە. ئیـــتر ناچـــار دەبـــووم ژووره تەنیاکەی خـۆم جێبهێڵمو لەژوورەکـەی دایکمو لەگەڵ تارماییـــەکانی ئەو و هـــەموو بیرەوەریـــەکانی لـــەو

ژوورەدا کەسوکناییان پێدەبەخشیم و خەمەکانمیان سوکتر دەکرد. هەستم دەکرد خەوەکەم هێمن ترەو ئارامتریش دەتوانم بیربکەمەوە، بەڵام ئەوەی زۆر سەرسامی کردبووم لەو ژوورەدا دایکم بوو، کە زۆرجار شەوانە دەهاتە خەونمو بە ئارامی لێی دەڕوانیمو هیچی نەدەگووت. هەستم دەکرد چاوەکانی پڕن لە گلەیی و گازندە، کە بۆ چی ناتوانم بە یەکجاری ئەو جاڵجاڵۆکەکانە دەربکەمو خۆم لە تەنیایی ڕزگار بکەم. لەڕاستیدا ئەو ماڵە بۆ من هەموو شتێک بوو. تەنانەت لە زۆر شتی پیرۆزیش خۆشەویستتر بوو لام، بەڵام نیگا بەردەوام پڕ لەگلەیی دایکم لە خەونەکانمداو ئەو جاڵجاڵۆکە بێزارکەرانە وردە وردە خەریک بوو تێڕوانینیان دەگۆڕیم. تا گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە خۆشەویستی سنووری بۆ نیە، لەهەر شوێنێک بیت دەتوانیت دڵت پڕ بێت لەسۆزو وەفاو خۆشەویستی. لە هەر کوێ بیت دەتوانیت پرشنگی دڵت بنێریت بۆ ئەو کەس و شوێنەی خۆت دەتەوێت. خەیاڵم کەوتەوە سەر وێنە هەڵواسراوەکەی سەرووی چرپا ئاسنینەکەم. کە دایکە هاجەرم هەڵیواسیبوو، دیارە ئەویش هەروا بێ مەبەست هەڵینەواسیبوو، بەڵکو مەبەستی سەرەکی

ڕاهێنانی چاوەکانی من بوو بەو تابلۆیە و هۆکارێکی باشیش بوو لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنی مندا خەیاڵەکانم گەورەببن و فراوانتر لێی ورد ببمەوە. هەستیشم دەکرد ئەو تابلۆیە زۆر نهێنی تیایە کە پێویستیان بە درکاندن هەیە. هەر بەکاریگەریی ئەو تابلۆیەش بوو کە سەرەتا هەوڵمدا شتێ لە هونەری شێوەکاریی فێرببم، دواجاریش بووە تاکە ئارەزووم، تا دەستم کردبە هەوڵدان بۆ زانینی نهێنیەکانی پەیکەرتاشیو سەرەتا شتێکیش لەو هونەرە فێربووم. دواتر قوڵبومەوەو تیایدا قاڵبووم. دەشمزانی دایکە هاجەرم هێشتا ئەو ئاواتەی نەهاتۆتە دی کە من بە خێزانە ون بووەکەی خۆم شاد ببمەوە، یان هەرهیچ نەبێت شتێ لەچارەنووسی ونی ئەوان بزانم. بەهانەی زۆر باشیشم کۆکردبۆوە تا بڕیاری گەڕانەوە بدەم بۆ ئەو شارەی کارەساتی شانزەی سێیان بەسەردا هێنا. بەم کارەم هەم خۆم لە تەنیایی ڕزگار دەکەمو هەم دڵنیادەبم لەچارەنووسی خێزانەکەم بەسەرجەم ئەگەرەکانیەوە. لە هەمووشیان گرنگتر هیواکەی دایکە هاجەرم دێنمە دی کە بەخەمی ئەو شارەوە هەر لە شانزەی سێدا گیانی سپاردو بۆ دواجار جێی هێشتم.

***

(باوکە) من پرسیاردەکەمو هیچیتر...

تـەنها بەپرسـیار دەتـوانم هەرەس بە نیگەرانـی خـۆم بێنـم و نەیهێڵـم. باوکـە مـن نـاتوانم چاوەڕوانـی وەڵام بـم. ئـەوەی مەبەسـتمە تـەنها پرسـیارکردنەو هیچیـتر، چونکـە وەڵامـەکان دڵنیـام دەکەنـەوە لـەو قـەدەرەی دەبێـت پـێی قـایلبمو بـیر لـە نیگەرانیـی نەکەمەوە کە سەرچاوەی بەردەوامیی ژیانەبۆ مرۆڤ.

باوکە .. پرسیارەکانم قوڵنین. من لە تاریکایی ژیانەوە دەڕوانمـە ئەفـسوونی ژیـان. دەزانـم هـەموو ئـەو کارەسـاتانەی منیـان فـێری گومـانو پرسـیار کـرد لـە ڕادەبەدەر زەحمـەتنو تەنانـەت لـە حەوسـەڵەو توانـای مرۆڤ بەدەرن.

مـن حـەز ئەکـەم هـەموو ڕابـردووم وەک خـۆی بگێڕمـەوە هـەموو داهاتووشـم بەنووسـینەوەی ستەمکارییەکان گوناهبار نەکـەم ... باوکـە لـە بێمانایی

ژیان وەڕس بووم بەشوێن مانایەکی ترەوەم کە قایلم بکات من کێم؟ کوڕی کێ؟ خەڵکی کوێ؟ کام ماڵ؟ کام گەڕەک؟ لە کوێوە هاتووم؟ بەشوێن چیدا دەگەڕێم؟ کێن ئەوانەی چاوەڕوانن و بۆم دەگەڕێن و نامدۆزنەوە. من لە بێکەسیدا بە شوێن کەسێکدا دەگەڕێم ئاشنامکاتەوە بە ژیان بەکەسانیتر بەوانەی منیش بە شوێنیاندا دەگەڕێم!

باوکە من چیرۆکی ئۆدیب پاشام خوێندۆتەوەو عەزابی سیزیفم بیستووە. خەریکە بە ناخی زەویدا ڕۆدەچم. باوکە بمپارێزە لە دووبارەبونەوەی گوناهە گەورەکانی مێژوو کە ڕوویانداوە یان ڕەنگە ڕووبدەن.

تاوێکی تر دەستەیەک مرۆڤ لە پیاوی بەساڵاچوو و چاو بە فرمێسک... دەستەیەک ژنی قژ ئاڵۆزکاو و دەم بەخەندە دێنە ئێرە کە بۆناسینەوەی من هاتوون. .. تۆزێکی تر لەم هۆڵەدا دەستەیەک کوڕی چاوەڕوان، چاو پڕ ئومێد لە ئامێزم دەگرن... چەندین کچی خەیاڵ باڵگرتوو ئاوات دەخوازن هی ئەوانبم، بەڵام ئایا کامیان باوک؟ کامیان برا؟ کامیان خوشک؟ کامیان دایک؟ کامیان کلیلی هەموو دەرگا داخراوەکانیی ڕۆحمە؟

باوکـه ئـەزانم مـرۆڤ چەنـد بـەهێز و کاریگەربێـت ناتوانێ بێ بیرکردنەوە گرێکوێرەیەک بکاتـەوە. ئەزانـم دەبـێ بیربکەمـەوە بۆئـەوەی خـۆم بدۆزمـەوە، بـەڵام نـازانم چـۆن گـویێم بـە زرنگانـەوەی نـاوی خـۆم ڕاهـاتووە. وەک ئـەوەی شـارێک هـەموو پێکـەوە هاواربکەن: عەلی.

بـەڵێ دەیبیـستم، تەنانـەت لـە خەونەکانیـشمدا بەزەنگی ناوی خۆم دێمەوە هۆش، ئەگەر چی نازانم بۆ ئەم ناوەم لێنراوە!! ڕەنگە سەدان نهێنیی لە ناوی منـدا هـەبێتو نـەیزانم. ئایـا موزیکـی وشـەکە سەرنجڕاکێشە؟ یان ناوەکەم کورتو مانا بەخشە؟ یـان بـەناوی پاڵەوانەکـەی سـەدەکانی ناوەڕاسـتی ساراکانەوە ناونراوم؟ ئـەزانم ناوەکـەم تەژیـە لـە سومبولو هێمـای جۆراو جۆر، بـەڵام مـن عەلیەکم جیاواز لەهەموو عەلییەکانی تر، عەلیەکی رووتوقوت. ئـەوەی کـە هەمـەو جیام دەکاتـەوە لەعەلییـەکانی تـر تەنهـا چاوەڕوانییـەکی بەردەوامـەو هیچیـتر. چاوەڕوانیەک کە پڕە لە ئومێدی پەشۆکاو لەخەونی بزر بزر، چاوەڕوانییەک کە پڕە لە حەزی پەژموردەو لێوانلێو لە نیگەرانی.

تـاوێکی تـر ئـەوان دێـن، هاکـا هـاتن. ئەوانـەی چـاوەڕوانی کردنـەوەی گرێکوێـرەی ژیـانی منـن‌و دەیانـەوێت هـەرچی زووتـرە گرێکـە بکەنـەوەو سەرفرازبن. دەیانەوێت بچمە باوەشی خێزانێکیانەوەو بـە تـەلی دڕکـاوی درشـت چـوار دەورم بگـرن، تـا لەمەترسـیی دوورمبخەنـەوە. دەیانـەوێت دڵنیاییـم مـسۆگەر بکـەن‌و گـوێ لـە خەمـە تـاڵ‌و شـیرینەکانم بگرن، یان لـە بێ ئومێدیدا بڵێن: بەداخـەوە عـەلی تۆ ناچیتـەوە سـەر ڕەنگی خەمـەکانی ئێمـە..! تـۆ هیچمـان نیـت. بەلەرینـەوەی دەنـگ‌و جوڵـە هەسـتیارەکانی جەستە شەکەتەکانیانەوە بڵێن: لە ئێمە ناچیت، تۆ هـی ئێمە نییت و ناچیتەوە سەر ڕەگ‌و ڕیشەی ئێمە.

یـان بڵێیـن: عـەلی تـۆش وەک هـەر منداڵێکی تـر، یـەکێک لـەو سـەدان منداڵـەیت کـە لەگـەڵ کەوتنـە خـوارەوەی بۆمبـە ژەهراوییەکانـدا ونبویـت‌و هـەموو شـتێکت لەگـەڵ خۆتـدا بزرکـردو دوا جـاریش لـە نـاو هەموو ئومێدە بەدینەهاتووەکاندا بیرچویتەوە.

باوکـە لـە یەکـەم ڕۆژی هەستکردنمەوە زانیومـە کـەژیانی مـن پڕتـەمتومان‌و مەترسـییە، بـەڵام ئـەوەی زۆر ئـازارم ئـەدات نـاتوانم گلۆڵـەی بیرەوەریـی خـۆم کۆبکەمەوە کە من کێم‌و لە کوێوە هـاتوم‌و چیـم دەوێ

لەژیان و چارەنووسم بە کویێ دەگات.

باوکە تەنها هەرخۆت دەزانی من چڵە پووشێکی دەم با بووم، ڕەشەبایەک ڕفاندمی سیخناخ بوو لە ژەهرو دوور ئێجگار دوور لەو دیوو سنورەوە لەباوەشی دایکێکدا ئۆقرەی پێگرتم کە هێشتا بۆنی دوکەڵو ژەهرەبام لێدەهات. وەک دایکێک کە چاوەڕوانی هاتنی کۆرپەکەیەتی ئەو هاتو گرتمیە ئامێزی دایکایەتی. من منداڵێکی بیمارو ئەو سەوداسەرێکی عەوداڵ بۆ ڕێزگرتن لە دایکایەتی خۆیو حورمەت گرتن لە ژنێتی خۆی. ماڵ بە ماڵ برینەکانی سارێژ دەکردم، زوخاوی جەستەمی لە بیمارستانەکاندا پاکدەکردەوە. شەوان بەدیار گریانە بەکوڵەکانمەوەفرمێسکی دەباراندو جار ناجاریش سۆزی دایکایەتی پێدەبەخشیم.

باوکە تۆ خۆت ئاگاداریو دەزانی وایە یان نا؟ باوکە من ڕقم لە دڵنیاییە دەزانم دڵنیایی چەند مەترسیدارو بێبەرهەمە. ئەو دەمانەش هاجەری دایکم بەجۆرێک دەدووا پیتەکانی هەر لە سەرزمانی دەتوانەوە. وشەکان بەریەک نەدەکەوتن ئەو بەزمانی دڵ دەدواو من بەهەستی هەموو ئەندامەکانی جەستەم تێدەگەیشتمو سەرم بۆ هەموو میهرەبانییەکانی

دەلەقاند، بێئەوەی یەک وشە چیە تێبگەمو ماناکەی بزانم.

هەمیشە شەوانە ئەو خەریکی جیاکردنەوەی خەمە ورد و درشتەکانی من بوو. ئاوا بالاًم دەکردو خۆشەویستی ئەو دەیپاراستم، تا گەورەبوومو خەڵفی قەدو پەلوپۆو چڵەکانم سێبەریان کردە سەر ڕۆحی پەژموردەی ئەو. باوکە چی بکەم کە تاوێکی تر خەڵکی شارەکەم ئاپورەم ئەدەن. لێم دەپرسن هەستی هەڵەبجەییەکی بریندار چییە؟ کاتێ بیرەوەریی مردن بە کوڵ دەگێڕێتەوە، یان دەپرسن ئایا دووری دایکە هاجەرو دایکە نیشتیمان بە چ پێوانەیەک دەپێورێ، لێم دەپرسن: شاری ئەسفەهان لەسنووری خەیاڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی تۆوە چەند دوورە.

باوکە ئەی ئەگەر من نەچومەوە سەر رەچەڵەکی کەسیان چی بکەم؟ هەستی هەڵەبجەییەکی بێنەوا دەبێ چیبێ ها باوکە؟ ئەبێ چی بێ منێک کە هێشتا تەمەنێکی زۆرم لە خەمو ئازار لەپێشە، حەزناکەم دڵنیاییم بە ئەندازەی گەمژەییم برینەکان ژەنگ پێهەڵبێنێ. ئەو وەک کاریلەیەکی ئاوەکی لە بەردەم گەلە گورگێکی برسیدا هەڵیگرتم تا گەورەبوومو ئێستاکەش کە پەردەی شانۆی ئەو

شاره هەڵدەدرێتەوە، لە خۆم دەپرسم باوکە لە تۆنا ... ئایــا ژیــان هێنــدە جوانــە تــا مــرۆڤ ئــەم هــەموو قوربانییانـەی لـە پێنـاودا بدات هـا؟ باوکـە ژیان هێنده جوانه؟ من دەڕۆم باوکـە. ئایا تـۆ هـەر لـە گەڵمدایتو گوێت لێمە؟ بە راستی باوکـە تۆ گوێت لێمـە؟ وامیلی کاتژمێرەکە گەیشتە کاتی ژوانی هەموومانـدەبێ بڕۆم دەبێ خـۆم تاقیبکەمـەوە(بـاوکە بەتەنیـا جێم نەهێڵیت) دەبـــێ بـــڕۆم بەیارمـــەتیت باوکـــە، بـــە یارمەتیـــت پەروەردگار.

❊❊❊

هەر لەسەرەتای گەڕانەوەی عەلییەوە بۆ شاری هەڵەبجە، دادگای باڵای شار بەهاوکاری پزیشکی دادوەریی بڕیاریدا لەهۆڵێکدا هەموو ئەو خێزانانە کۆبکەنەوە کە منداڵیان لە کارەساتی شانزەی سێدا لە شاری هەڵەبجە لێ ون بووەو تا ئێستا هیچ کەس هیچیان دەربارە نازانێت، بەڵکو بەپێی لێکۆڵینەوە زانستییەکانو پشکنینی تاقیگەیی(DNA) کەعەلی بناسرێتەوە سەر بەگروپی خوێنی کام خێزانەیە. هۆڵەکە بەتایبەتی بۆ یەکلاییکردنەوەی دۆسیەی عەلی ئامادەکرابوو کە دەکەوتە ناوەندی شاری هەڵەبجەوە، هۆڵەکە بەکورسیو مایکرۆفۆنو چەند مێزێکی لاکێشەییەوە ڕازێندرابۆوە. دەیان خێزانی منداڵ بزربووی کارەساتەکەش ئامادەببوون بۆ ناسینەوەی منداڵەکانی خۆیان. بەجۆرێکی سەرسوورهێنەر دادوەر سەرنجی لە سەر عەلی هەڵنەدەگرت. وەک

ئـەوەی پێـشوەخت لەنـاخی خۆیـدا بڕیـارێکی دابێـتو حەز نەکات گفتوگۆ و لێکۆڵینـەوەی دوورو درێـژی لـە سـەر بکرێـت. لـەلای چـەپی مێزەکـەوە کـە بەرامبـەر ئامادەبوانی هۆڵە سیخناخەکە دانرابـوو، پزیشکەکە بـە جلوبـــەرگێکی درێـــژی ســـپییەوە کەتایبەتـــە بەنۆژدارەکان دانیشتبوو. کەپیاوێکی سـوورو سـپی و قـژ مـاشو برنجـی بـوو. دوایـی دەرکـەوت نـەک هـەر دادوەرو پزیـــشکەکە، بـــەڵکو ســـەرجەم ئامـــادەبوان بەژنو پیاو و منداڵو گەنجەکانیشـەوە، چاویان لە سەر عـەلی نـەدەتروکان. دیمـەنی ڕێکپۆشـیی پزیـشکەکە بـە جۆرێک سەرنجی عـەلی ڕادەکێشا پزیشکەکە هەسـتی پێدەکردو جاروباریش نائاسـایی، لـە چەنـد چرکەیەکدا چەنـــد جارێـــک ملیوانـــی کراســـەکەیو بۆینباخـــە سـورەکەی ڕێکـدەکردەوە. دەسـتی بەقژیـدا دەهێنـا. جـــارو بـــاریش شـــانەکانی هەڵدەتەکانـــد. نیگەرانیـــی پزیشکەکە پرسیارێک بوو لای عەلی، زۆر لێکدانـەوەی جیـاوازی هەڵـدەگرت، بۆیـە لـە ناخـدا هەسـتی بـە ناتەباییـــەک دەکـــرد، لـــەنێوان ئامـــادەبوونو ئامـــادە نەبوونیدا. دانیشتنەکە لـە نمایشێکی سیاسـیی دەچـوو، بۆیـە تـابلێی پـەرشو بـڵاو و بـێ سـەروبەر دیـاربوو. چـونکە هـەر ئەگـەرێکی بـاش یـان خـراپ هیـچ لـە

بەسەرهاتی ئەم ناگۆڕێ، هێندە نەبێ برینەکان سەر لە نوێ دێنەوە سوێ. عەلی وەک مەلێکی تازە لە قەفەزنراو دەیڕوانیو هیچی نەدەگوت، جگە لە سەرسامی کە پڕ بوو لە هەستی ئەزموونێکی تازە و لەنزیکبوونەوەی گەیشتن بە سەرەتای ڕێگەیەک کە خۆیشی نەیدەزانی بەرەو کوێ دەیبات. بۆیە هەر ئەم سەرەتایە جۆرە ماتەمینییەکی تێکەڵ بە خۆشییەک دەکرد کەس بۆی نەدەکراو نەیدەتوانی هۆکارەکەی لێکبداتەوە. هێشتا سەرەتابوو، وەلێ دیاربوو چ جۆرە چاوەڕوانییەک باڵی بە سەر هۆڵەکەدا کێشاوە، کە پڕە لە خەمو نیگەرانییو دوودڵی، جگە لەوەی لە هەستی هەر ئامادەبوویەکدا مژدەیەکی شاراوە حەشاردرابوو، بەڵام هێزی ماتەمینیو یادەوەریی کارەساتەکە نەیدەتوانی ئەم سێبەری مژدەیە لە سەر لێوی هیچ کەسێک لەئامادەبوواندا بدۆزێتەوە. عەلی پاش بێدەنگییەکی زۆر کەوتە قسە بە جۆرێک دەدوا، وات هەستدەکرد دەیەوێ ئەوەی دەیزانیو فێربووە هەمووی بەجارێ بگێڕێتەوە. هێندە خێرا دەدوا کەس فریای چەشتنی ئازارو خەمێکی ئەو نەدەکەوت. تەنانەت خەمێکی لەویتری پێ جیانەدەکرایەوە کە هەر دیمەنێ لەو دیمەنانەی باسی دەکردن دەکرا دەیان

ڕۆژ غەمگینو دڵتەنگت بکات. عەلی زیاتر لەمایکی سەر مێزەکە نزیک بووەوە، کە بە تەنها بۆ ئەو ئامادەکرابوو تا وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە دادوەر و پزیشکەکە دەیکەن، بەڵام بە جۆرێک شڵەژابوو، نەیدەتوانی قاچو دەستە لەرزیو و ناجێگیرەکەی ئۆقرە پێبگرێت. سەرئەنجام کەوتە قسەکردن: بمبەخشن، من ناوم عەلیە، نازانم ئەندامی کام خێزانم! خەڵکی کام گەڕەکم! تەنها دەزانم هەڵەبجەییمو هیچی تر. هیچ کەسێکم لە دەمارە وردەکانی خوێنو ئێسکی خۆمم بیرناکەوێتەوە، ئەوەی بە تەواوەتی دەیناسم تەنها دایکی میهرەبانی دوای کارەساتەکەیە کەدایکە هاجەرمە. ئەو بەزمانو هەستی شیعرەکانی سەعدی شیرازیو عومەری خەییام دەدوا، بەڵام ئارەزووی لە حیکمەتو پەندەکانی پیاوە زاناکانی سەردەمی جاهلیو خێڵی قورەیش بوو. کە گەورەتر بووم ئینجا زانیم ئەو سەر بە دەستەی چەپی منارە بەرزەکانی کەربەلاو بیابانە سەرابنشینەکانی ئەوێیە. هەموو ژەمێ بە قورگی پڕ گریانەوە دەیگووت: گیانم دەرچێ حسەین، چۆن توانیان بە تینوێتییەوە بتکوژن، تەنها عەلی دەزانێ برسێتی مانای چییە و تینوێتی چ کارەساتێکە. کاسە

ئاوەکـــەی هەڵـــدەگرت، دەنگـــی بـــەرزدەکردەوە و دەیگووت: یا عـەلی .. ئینجا لێوە وشـک و برینگەکانی تەڕ دەکرد. دەربارەی ئـەو شـتێ نـازانم لـەوەی چۆن تــەزبیحی هــەزارو یــەک دەنکــەی تەمــەنی خــۆی هۆنیوەتــەوە. ئــەو لــە شــاری بــەرینی ئەســفەهان گـەورەبوەو هـەتا مـردیش گـۆی زەوی بـە دوو بـەش تێدەگەیشت، بەشێکیان ئەسفەهان‌و بەشەکەی دی ئەو شارانەن، کـە بـە نەخشـە لـەدوری خـەیاڵ بـەرینترن و دەچنـەوە سـەر گـەورەیی شـاری ئەسـفەهان. مـن لـە نێوان عـەلی ئەسفەهانی و عـەلی هەڵەبجەییدا، گومان لـەو کەسانە دەکـەم کـە نـاتوانن سەرزەنشتی خۆیـان بکەن، کاتێک ژیان دەکەن بە دووبەشی نایەکسانەوە، بەشە گەورەکەی هی خۆیان‌و بەشـە بچوکەکـەش هـی هەمووکەس. بەهەرحاڵ ڕەنگـە کارەسـاتێک ناوەکەمـی بیربردبێتەوە ڕەنگە ئەویش ژەهرباران کرابێت. نـاوی لاپــاڵی شــاخێک، یــان گۆمێکــی مــەنگ، یــان گوڵــە ئەســتێرەیەکی تــیژڕەو، یــان درەختێکــی بــاڵا بــەرز بووبێـت. تـەنها ئەوەنـدە دەزانـم مـن بەعـەلی بانگـم ئەکــەن‌و ئــەو نــاوەش لــە بێژنگــی ســەری دایکمــدا داچۆڕاوە. ماناکەشی هـەر لـەناخی ئـەودا گوڵدەکات و بۆن و بەرامەی خۆی هەیە. بەڵێ من ئـەوم .. عـەلی ..

ڕەنگە ئێستا بەرامبەر خوشک یان برا یان دایکو باوکم ڕاوەستابم. ئەو دایکەی بە شیری مەمکەکانی گۆشیکردوم‌و چەند ساڵێکیش شەونخونیی بە دیارمەوە کێشاوە. ڕەنگە هەر بە لەرینەوەی دەنگم تەلی ئەو کەمانە لە ناختاندا لێبدات کە سەمایەکی سیحرییە بۆ ناسینەوەی یەکتری. لە ڕاستیدا من بە شوێن دڵنیایدا ناگەڕێم، بەڵکو نیگەرانیم دەمخاتە بەردەم زۆرپرسیاری سەرسوڕهێنەر. لەکاتێکدا وەک باڵندەیەکی دەستەمۆ حەزدەکەم بێمە نێو چنگی هەریەکێکتانەوە. پرسیارەکە لێرەدایە؛ ئایا دەکرێت باڵندەیەکی نیگەران لە چنگی کەسێکدا دڵنیابێت کە نازانێ چارەنوسی بە کوێدەگاو چی چاوەڕوانیەتی؟ دەزانم سەدان کەس لەم شارەدا چاوەڕوانی خۆشەویستێکی خۆیان دەکەن، خۆ ئەگەر نیشانەیەکیش لە سەر یەکێ لە ئەندامەکانی جەستەم هەبێ کە گەواهیدەربێ لە نزیکبونەوەم لە یەکێ لە ئێوە، بەڵام ئایا دەکرێت چیرۆکی من لە چیرۆکی هێماکانی جەستەی دەیان کەسیتر بچێت کە لەم هۆڵەدا چاوەڕوانن لە کاتێکدا چیرۆکی هەر یەکێ لە ئێمە، ئەوانەی لێرەن‌و ئەوانەی هەڵوەداو بێ ناسنامەن جیاوازن‌و، هەریەکەشمان لەگۆشە نیگایەکەوە

دەردەکــەوین کەڕەنگــە هــونەری هیــچ وێنەگرێکــی شارەزا پەی پێ نەبات، چۆن ئەو گۆشانە بدۆزێتـەوە لــە بەرمەترســـیو گــەورەیی کارەســـاتەکە. لـــەم ســـەردەمەدا کــە ئــازادی وەک تنۆکێــک فرمێــسکی قەتیـــسماو وایە لـــەچاوی بـــێ ئومێدێکـــدا، مـــن گەڕاومەتەوە تا بەشداربم لـە کەرنـەڤاڵی هـەر کەسێ کــە دەخــوازێ بەشــوێن زێــدو بیرەوەریــی خۆیــدا بگـــەڕێت. تەنانـــەت تـــامەزرۆی بینیـــنی ســـەگێکی دەربـازبوم لـە ژەهرەبـای کارەسـاتەکە کـە بەشـوێن بیرەوەریـی خۆیـدا گـەڕابێتەوە. حـەز دەکـەم لەوپۆلـە مەلــە کۆچەرییانــە بــڕوانم کــە ڕزگاریــان بــووە لــەو ڕۆژەداو دەستی مەرگیان نەگەیشتۆتێ، کاتێ بەقەتارە دێنەوەو مەلە، لەژەهر دەربازبوەکان لەپێشەوە تەتـەر ئاسا چیرۆکی ئەو ڕۆژەیان بۆ دەگێڕنـەوەو ئەوانیش هەموو بە نەغمەیەکی غەمگین شتێک ئـەڵێن. غەمگینتر لەو گۆرانیانەی بەبڵاچەیەکی بچووک ئاگر لە دەروون بـــەردەدەن. دەزانـــم ئێـــستە مـــن هیوایـــەکم لەدڵـــی هەریەکێکتانــدا، ئێــوە حـــەز بـــە گەشـــانەوەی ئـــەو پشکۆیانە دەکـەن کـە لەناختانـدا سـروەیەکی غەمگیـن خـەریکی گەشـانەوەیەتی. تەنانـەت ئـەو چیرۆکانـەش دەزانـم کـە فاڵچییـەکان دنیایـەکی پڕلە ئومێدیان بـۆ

بنیات ناون. من وەک مەلێکی باڵشکاو دەمەوێ بفڕم، بەڵام بەپێچەوانەی فڕینی مەلە تەریوەکانەوە دەمەوێ بفـڕم بۆئایندەیـەکی دوور. ئـەو ئایندەیـەی چیرۆکـی مـەلێکی پەڕاگەنـدە ئاشـت دەکاتـەوە بـەژیان. تابزانـم کوێی تری گۆی زەوی ژەهرباران دەکرێتو چیرۆکی گەڕانەوەی ئەوانـەی ڕزگاریـان بووە لـە مـردن چییە؟ نازانم ئەمە ئەنجامی هەست بە تەنیایی کردنمە ...!

یـاخود تـەنیایی حیکمـەتێکی جوانـە بـۆ قـەدەری مـەلو مـرۆڤو گیانلەبـەرە تـەریوەکان. مـن لـە خـۆم دەپرسم لە ئێوە نا؛ تەمەنی بیستو ئەوەندە ساڵەم چ مانایـەکی هــەبوو؟ مــادام مــن تــەنیاییم دەبەســتەوە بــەدەیان چیرۆکــی دەســتکردو ڕوداوی ڕاســتەقینەی تـــرەوە کـــە نەمـــدەزانی لـــەکوێ بیـــستومە، یـــا خوێندومەتــەوە ئـەو ڕوداوانــەی مـرۆڤ دێننـە سـەر چـۆک، کڕنـوش بـە مـرۆڤ دەبـەن بـۆ ڕێگەیـەک بیانگەڕێنێتەوە بۆ ژیان. یان دەبنە هۆی بە هێزکردنـی ئـــەو توانایـــەی مـــرۆڤو پەلـــەوەرو گیانلەبـــەرە یاخیـەکانیان پـێ دەناسـرێنەوە. مـن لـەوێ لـە شـارێک متوربە کرام بە ژیـان. شـارێک جوانتر لـەو خـەیاڵـەی نەخشەسازێکی شارەزا دەیـەوێت خـەونی پێوە ببینێ. شـاری ئەسـفەهان بـۆ مـن شـاری خـەونی مـردوو و

زیندوەکان بوو. خەونە مردووەکانمی تێدا دەژیانەوەو خەونــە زیندووەکانیــشمی تێــدا گــەورەو فراوانتــر دەبوون. لەوێ ڕۆژانە دەمڕوانییە مۆزەخانەی (چل کۆڵەکــە) کــە مــێژووی دوور و درێــژی نەوەکانــی پێشوی تێدا تۆمار کرابوو. لە یەکەم شەڕو یەکەم خوێن ڕشتنو یەکەم داگیرکارییو یەکەم سەنگباران. تا یەکەمین ژوانو یەکەمین دڵداریو یەکەمین ماچو یەکــەمین لەئــامێزگرتن. شــەوانی تــەنیایم لــە (باخــی پەلەوەرەکان ) بەسەر دەبرد لەوێ خەمەکانم بەسەر ڕەنگــی گوڵەکانــدا دابــەش دەکــردو لــە ســەروە بــاڵا بەرزەکان دەپاڕامەوە لە مەترسی کەوتنە خوارەوەی بێچوە هاقووە دەنگ خۆشەکان. بۆ یەکەمین جارلەو باخەدا هەستم بە نیگەرانیی باڵندەکان کرد. کاتێ هەر بــە ئــارەزوو باڵندەیــەکم خــستەنێوان هــەردوو دەستەساردو سڕەکانمەوە. باڵندەیەکی باڵشکاو، من دەســتەکانم گوناهبــار کــرد بە گرتــنی ئەو باڵنــدەیە دەستەکانم تاوانبار کرد تاباڵندەکان تووڕە ببن هەر ئەوەنـدە و لـە چوار لاوە، لـە سـەر دڕکـەزی قـەراغ باخەکەو لە ناوقۆپەنی گوڵە ڕەنگاو ڕەنگەکانداو لە ســەر پــەلوپۆی هــەموو درەختــەکان باڵنــدەکان بــە جۆرەها ئاواز دەکەوتنە خوێندن. بە جۆرەها نەغمە

گوزارشـتیان لـەنارەزایی خۆیـان دەکـرد. هەنـدێکیان باڵـەکانیان لـە زەویەکـە وەردەداو دەنوکیـان لەقـەدی درەختەکان وبەردی ڕیزکراوی گۆمی ناوباخەکە دەدا. باخەکـە سـەرتاپا ببـووە سـیمفۆنیایەکی غـەمگین. کـە چیرۆکـی مەرگەسـاتی شـارێ بگێڕێتـەوە. شـنەبایەک درەختـــەکانی هێنایـــە لـــەرزین، گوڵـــەکانی خـــستە سەرســـەمایەکی شـــێتانە. دەچوومـــە ژێـــر هـــەر درەختێکـەوە سەرشـانو ناوچـەوانو هەمووجەسـتەم دەدرانــە بــەر ڕیقنــەی ســپیو ڕەشو خۆڵەمێـشیو هەموو ڕەنگەکانی تری ڕیقنە . هەستم دەکرد خەریکـە زریکـە دەکـەمو دەمـرم. خـەریک بـوو زەنـدەقم بچـێ، لـەوەی هـەر ئێستا نـا، تـاوێکیتر لـە هـەموو لایەکـەوە دێـنو هـەر بـەدەنوک هـەردوو چـاوم هەڵـدەکۆڵن، بـە پەلـە داوای لێبـووردنم لـە باڵنـدە باڵـشکاوەکە کـرد. داوای لێخۆشبونیشم لە هەموو پەلەوەرەکانی ترکـردو دڵی هـەموو گوڵـە ڕەنگاوڕەنگەکانیشم دایـەوە. سـەرم نـەویکرد وەک ئەوانـەی لـە ئاسـتی جوانیـدا کڕنـوش دەبـەن، یـەک بـە یـەک درەختـەکانم بەسـەرکردەوە. پەشـیمانی خـۆم دەربـڕی بۆیـان و زۆریـش تەریـق بوومـەوە. هەسـتم کـرد ئـازادی پێویـستی بـە هـەموو نەغمەکانـە، پێچەوانـەی مـرۆڤ کـە هەمیـشە بەیـەک

نەغمە بۆ ئازادی دەخوێنن. دایکە هاجەرم هەمیشە چیرۆکی گۆڕی بە کۆمەڵی پەپوولە پایزەکانی بۆ دەگێڕامەوەو، لەگەڵ قرشە خۆکوژەکانی گوێ زەریا زەبەلاحەکاندا بەراوردی دەکرد. شەوان درەنگ داستانی ڕەنجی بەخەساری فەرهادی کۆکەنی بۆدەگێڕامەوە. چیرۆکی بێهودەیی گەڕانی گلگامێشی بۆباس دەکردم. کە بەدوای گیای نەمریدا دەگەڕا. من هەموو چیرۆکەکانی دایکە هاجەرم والێکدەدایەوە کە؛ هەموو گیان لەبەرەکانی سەر زەمین مەترسی ژەهرخواردوو کردنیان لەسەرە وەکو چۆن پەپوولە پایزییەکان ڕەشەبای مەرگ دەیبردن‌و فەرهادەکان ڕەشبین دەبوون‌و گلگامیشەکان بێئومێدو ڕەنج بەخەسار چۆکیان دادەدا بۆ مردن. هەستەکانم وەک گلۆڵەیەک بەنی ئاڵۆزکاو تادە هات زیاتر تێکدەچڕژان‌و سەری گلۆڵەکەم پێ نەدەدۆزرایەوە لە بەریەکڕەنگی هەموو گلۆڵە ئازارەکانم کە لەو ساتو زەمانەوە دەست بە چنینی کرابوو، ژەهرباران خەیاڵی لێک ترازاندبووین، تەنانەت من ئیرەییم بەو خواپێداوانە دەبرد چەند خۆشبەختانە لە پاڵ کێلە بەردینەکاندا وەستاون‌و، ناوی هەموو خۆشەویستانی خۆیان دەخوێننەوە. دواجار پێش زەردەپەڕ ماڵئاوایی

له گۆڕه بەکۆمەڵەکان دەکەن‌و دەڵێن: به هیوای دیدار ئازیزه لێک دابڕاوەکانی ژەهرەبا.

مـن لـەوڕۆژەوه هەسـتم بـه تـەنیایی کـرد کـه هاجەری دایکم هەوڵی دەدا ئەوگۆرانیانـه فێرببم کەبۆ لاواندنەوەی دڵی خۆی و، زیندوکردنەوەی بیرەوەری مــن خــۆی فێرکردبــوو. کــه دەمزانــی ئــەو ســەدا غەمگینانـەم بیـستووەو سـەرچاوەکانیان نـازانم. ئـەو هەمیشه کاسێتێکی کۆنی دەهێناو بەهێواشـی دەیکـرده نــــاو ڕیکۆردەرەکـــــەوەو بــــەزۆر خــــۆی‌و من‌وچـواردەووری ژورەکـەیان دەهێنایـه گریـان. مـن ئەوکاتـەش ئـەم خەمـه قوڵـەم هەسـت پێدەکرد، وەلـێ سـەرچاوەکەیم نـەدەزانی کـه بـەدەنگی پۆلـه ژنێکـی دەنگخۆش پێکەوه دەیان وتەوە. وەک گریـانی بەکوڵـی یـادی کەسـێک کـه سـەدان سـاڵ بـوو لـه سـاراکانا کوژرابوو، لەگەڵ دەیان هـەزار شمشێربەدەسـتی تـردا خـەڵکانێکی زۆر بـۆ ئـەو دەگریـان‌و لـه خۆیـان دەدا، فرمێـسک وەک بـاران بەسـەر ڕوومـەت‌و چەناگەیانـدا دەهاته خوارەوه بێ ئەوەی باسـی یـەک دڵۆپـه خوێنـی هاوڕێکــانی بکــەن، کــه هــەزاران شمشێربەدەســتی شـەڕکەربوون. خوێندنی ئـەو دێڕه بەسـۆزانه هـەموو ئـەو فیلمانـەی بیردەهێنامـەوه کـه لـه جەنگـه گـەورەو

بچووکەکاندا بینیبوم یابیستبوم، کاتێ لەبەر خاتری قسەی فەرماندەیەک، لەبەر نەشکاندنی پەیمانی سەرکردەیەکی تورە گوندەکان خاپوور دەکران‌و جەنگەڵەکانیان دەبڕیەوەو ڕێڕەوی چۆم‌و ڕووبارەکانیان دەگۆڕی‌و، پەلەوەرو درەخت و شینایی ئاسمانیان گوناهبار دەکردو بڕیاری مردنیان بۆ پەلەوەرە بێ زمانەکان‌و تەنانەت پەلەوەرە لاسایی کەرەوەکانیش دەردەکرد. نەوەک ڕۆژێ لەڕۆژان لاسایی فەرماندە یان سەرکردەیەکی شەڕکەر بکەنەوە. لاواندنەوەکە هێندە بەسۆزبوو لە ڕاستیدا هۆن هۆن من‌و دایکە هاجەرم‌و هەموو ژوورەکەش لە گەڵماندا دەیاندایە پرمەی گریان زۆرجاریش شووشەی پەنجەرەی ماڵەکەمان‌و شووشەی بلوری چرای ژوورەکەمان دەیاندایە هاڕەی شکان و دەبوون بەهەزارەها پارچەی لەیەک نەچوووەوە. چەند دەنگێکی غەمگین لەڕیکۆردەرەکەوە بەسۆزەوە لەگەڵ کۆمەڵێ دەفژەندا، دەرویێشانە دەیانچڕی:

تۆ ئەی بەهەشتی ژەهرخوارد کراو
سڵاو بنێرە بۆ ئاشتی دزراو
بڵی جاڕنامەی مافی گەردوونی،

هەبێ یانەبێ . . باشە یاو خراو.
نزا پیاوچاکان، مەدەد پیرشالیار
جۆگەلەی مردن وابوو بە ڕووبار
تانە لە کێ بەین، بەکێ بڵێین بۆ؟
کەڕاستی بۆتە ئاوێنەی درۆ.
باهۆزی مەرگ ، ڕێژنەی ژەهرەبا
چۆک بەبڵندگۆی پەیمانی ئاشتی جیهان دادەدا

***

دایکـم خـێرا دەسـتی دەنـا بە ڕیکـۆردەرەکەداو بێدەنگی دەکرد.

مـن هەسـتم دەکـرد دایکـم مانـای شـیعرەکان بـە تــەواوی تــێ ناگــات، وەکــو چــۆن لێیــان تێدەگەیـشت هەموو جارێک ئاواش بۆی دەگێڕامـەوە، ئەگـەرچی بـە هەمان سۆزی ڕیکۆردەرەکـە دەیووتـەوە، بـەڵام کوڵـی گریانەکەی گەواهیدەری ئەو سۆزەی بوو کـە هـەرگیز پێی نەدەشاردرایەوە، تەنانەت ئەو کاتانەش کە حەزی نەدەکرد من بزانم کە دەگریو، بەسـۆزە غەمگینەکـەی نــاو کاســێتەکە خــەریک بــوو لــەهۆش خــۆی بچێــت. دەیوت: تۆ مەگری عەلی کوڕم بەسیە ئیترمـەگری، تـۆ بچۆرە دەرەوە بایـەکی بـاڵی خـۆت بـدە. مـن دەمزانـی هێـشتا دایکـم کوڵـی دانەمرکاوەتـەوەو دەیـەوێ لـەم کۆتەڵەدا بەشداری نەکەم. بە تـەنها هـەرخۆی هـەرچی زوخــاوی ئــەو کارەســاتەیە لــە ناخیــدا پەنگــی

خواردۆتەوە بە فرمێسک دایبڕێژێ.

بەڕێزان ئێستە من بەرامبەر بە ئێوە ڕاوەستاوم، کە هەر یەکێکتان خاوەنی چیرۆکێکی پڕکارەساتی خۆیەتی. پێچەوانەی چیرۆکی ئەو جەنگاوەرە کوژراوانەی دوای سەرکەوتنی شۆڕش هەندێ لە زیندوە ترسنۆکەکان دەیانکەن بەناوی خۆیانەوەو تامردن پێی دەبن بە پاڵەوانو مێژووش سوکو ئاسان چیرۆکەکان دەکات بەناوی ئەمانەوەو ئیتر تا هەتایە کوژراوەکان بیردەچنەوە. دەترسم هەڵەم کردبێت، یان خراپو ناجۆر بیربکەمەوەو مافی کوژراوەکانم خواردبێت. کە نازانم شاعیرانە ستایشی ئەو مێژووەبکەم، کە هیچ مەخلوقێک ڕاستیەکەی بە تەواوی نازانێ گوللەو مردنو گڵ نەبێت. من لەچاوی پڕلە گریانی هەریەکێکتاندا چیرۆکێکی کارەساتبارتر دەبینم لەوی دیکەتان. تۆ دایکە ڕەشپۆشە غەمگینەکە، تۆش پیاوە بالآبەرزە حەپەساوەکەی ئەوبەر. ئێوە هەموو ئەو مێردمنداڵە سەودا سەرانەی بە شوێن نەوەکانی پێش خۆتاندا دەگەڕێن.

***

لــە شــوێنێکی کــەمێ شــاراوەو پــەراوێزخراوی هۆڵەکــەدا، ژنێکــی بــاڵا بــەرزی قــژ درێــژ کراســێکی مۆدێرنــی ئــەوروپایی لــە بــەردابوو ســەرنجی عەلــی ڕاکێشا. چونکە ڕێک لەتابلۆی هونەرمەندێکی جیهانی دەکــرد کــە بەتــەنها هــەر نــەیتوانیوە ڕۆح بکــات بــە بەریــدا . ئــەو نــە پێدەکــەنیو نــەدەگریا، ڕێــک لێــوە بەناوبانگەکـــەی جیـــۆ کەنـــدای لیۆنـــاردۆ داڤنـــشیم بیردەکەوتـــەوە. ســـەرنجی لـــە پەیکـــەرێکی بەفریـــن دەچـوو، پێـش تواندنـەوەی لەبـەردەم تیـشکی خـۆری بــەیانیانی ئەســفەهاندا. وەهــای وێنــا دەکــرد کە ئــەو لەغەریبەیــەک دەچــێ تــا خانەخوێیــەک خوڵقــی بکــات بۆمـــاڵی دڵێکـــی چـــۆڵ وهـــۆڵ. ســـەرنجی لـــە ســـەر هــەڵگرتو سـیمای ئـەو پیـاوە ڕیـش سـپییە سـەرنجی ڕاکێشا، کـە لـەنێوان ڕیشە سـپیە چرچەکەیدا فرمێسک وەک چۆڕاوگــەی گوێــسەبانە قوڕینــەکان دادەچــۆڕا،

بۆیە جارێکی تر نەستەکانی گەڕانەوە بۆ ئەو کاتەی هەواڵی بێ وڵاتیو کارەساتی بزر بوونی خۆیان پێدا. لە هۆڵەکەدا کە ڕەنگی خۆڵەمێشی دیوارەکانی دەچونەوە سەر ئەونیگایانەی تادەهات تاریکتر دەیانڕوانی. لە جەنگی ڕەنگەکانی ناو هۆڵەکەدا رەنگی خۆڵەمێشی زاڵتر دەبوو بە سەر ڕەنگەکانی تردا. عەلی لە هۆڵەکەی دەڕوانی. بە درێژی و پانی هۆڵەکە سەرنجی دەداو تێڕادەما، جارێکو دوو جارو دەیان جاریتر تێهەڵدەچۆوە. ئامادەبووانی ناوهۆڵەکە هەر یەکە بە شێوەیەکی جیا لەوی تر دەیڕوانی. بەچاو و دەم و برۆکانیان دەپەیڤین. بە ئەندازەی ئارەزووە شاراوەکانی دەروونیان خۆیان دەبزواندو شوێنیان بە خۆیان نەدەگرت. هەر یەکە بە شێوازێکی جیا بانگی دەکردم؛ عەلی تۆ کوڕی ئێمەی، تۆ کوڕە ونبوەکەی ئێمەیت، بەدەنگو سیمایان دەپاڕانەوەو هانایان دەبرد بگەڕێمەوە لایان، بچمە ژێر باڵیانەوە، دەست بکەمە ملیان. هەریەکەیان بەناوی خۆیانەوە بانگیان بکەمو لە سیماو پەرۆشیەکەی ئەوانەوە بیرم لەو ساتانە دەکردەوە دایکە هاجەرم لە کۆڵانەکەماندا دەیقیژان: وەرە ژورەوە عەلی دیسان بزر دەبیتەوە. عەلی من کێم هەیە جگە لەتۆ. کوڕم کێم هەیە تۆم بۆ

بدۆزێتەوە. ئەگەرچی لەم هۆڵەدا هەست بە غەریبی ناکەم، تاڵە داوێکی هەست بزوێن وەک تاڵە داوی کەمانچەیەک لە بەستەیەکی غەمگیندا، بۆ بزواندنی شاعیرێک کە خەمێکی تەنک چەشنی پەیدابوونی پارچە هەورێک لە سەرەتای بارانی بەهاردا تەنگی پێ هەڵچنی بێت، تاکو شاکارێک بخولقێنێ، ئاوا منیش هەستم دەبزوێ، بۆ هەر یەکێکتان ئەو هەستەی دەمخاتە سەر کەڵکەڵەی خەیاڵێکی شیرین، کە دەیان چیرۆکی نەمر دەخولقێنێ. بە تایبەت ئارامیی ئەو کچە باڵا بەرزە جل ڕەشە، دەڵێی مەتەڵێکی لە مێشکدایەو تەنها بەو ماناکەی لێک دەدرێتەوە. من نایناسم نازانم تەمەنی چەندو خەریکی چییەو چی خوێندووەو حەزو ئاواتو ئارەزووەکانیشی نازانم، بەڵام هەستەکانم ئەو هەستانەی پێش ڕوودانی بومەلەرزەو ڕەشەبای وێرانکەرو هەڵچوونی دەریاکان هەمووجەستەم ئاگاداردەکاتەوە، تەنانەت سەرتاپا ئەندامەکانی جەستەم عارەقەی ماندوو بوونی ئەو هەستانەم دەردەکەن. کەپێم دەڵێن: ئا ئەو دەناسین هەموو هەستەکانمان یەک بە یەک هەستی بۆن کردنو هەستی لەزەتو هەستی بینینو بیستنو دڵنیابوون. وەکو ناسینەوەی ئەو گوڵە ڕەشەی لە ناو باخچەی

گوڵــه باخــه ســپیەکاندا جــوێ دەکرێتــەوە لەهــەموو گوڵەکانی ناو باخچەکە. عـەلی هێنده لەسـەرخۆ دەدوا بەئاسانی کەس نەیدەتوانی وشەکانی ببیستێ. تەنانەت ڕەنگە هیچ کـەس لـەم هۆڵـەدا ڕستەیەکی تـەواوی پـێ کۆنەکرابێتــەوە لەودەنکــە تەزبیــحە وشــە هەڵــڕژاو لێکترازاوانەی. دادوەرکە پیاوێکی باریکەلـەی هەمیشە دەم بەپێکـەنین بـوو. بەدەنگێکـی لەرزۆک دەدوا وەک ئەو دەنگـانەی کە هــەرگیز نـاتوانی گوێیـان لێنـەگری کاتێـک دەکەونـە قـسەکردن. ئـەو خـۆی لـە بەرگێکـی ڕەشی سادە هەڵکێشابوو. بۆینباخێکی سووری تۆخـی بــە ســتبوو، کــە ببــوە نیــشانەیەکی جیــاواز لەگــەڵ پێکهاتەی جلوبەرگو قژە ڕەشـەکەی، بەوەی هەمیشە دەستی لە کاغەزەکانی بەردەمی وەردەدا کەمێ جرپن دیـاربوو، وەک ئـەوەی هەسـت بـە گونـاهێ بکـات کـە دەیــەوێت بیکــات، یــان کردوویــەتیو پەشــیمانە لــەو گوناهــە. وەک بڕیــاری ئــەو گوناهانــەی ســەرکردەی جەنگــە گــەورەو بچووکــەکان دەیــدەنو دواییــش پەشیمان دەبنەوە لێی. کەمێ نوشتایەوەو دوایـی هـەر بەهــەمان خێرایـی قنـج دانیـشتو خـۆی بـۆ پرسـیارە سەرەتاییەکانی دادوەریەکە ئامادە دەکرد.

***

- ناوت؟

+ عەلی

- تەمەنت؟

+ ڕەنگە بیست و چوار ساڵانە بم

- وتت ڕەنگە؟

+ بەڵێ ڕەنگە

- ناوی باوک؟

+ نازانم

- ناوی دایکت؟

+ هاجـەر، دایکـی دوای ژەهربارانەکـە ، دایکـی ڕۆحیم !

- دادوەر: لەوە گەڕێ ناوی خوشک، یان برا؟

+ نازانم

دادوەر شـڵەژا، وەک ئـەوەی سـەرەداوی گڵۆڵـە ئاڵۆزکاوەکـەی دادگایکردنەکـەی نەدۆزیبێتـەوە، بۆیـە

زۆر ساكارانه كەو تەپرسيار، كەڕەنگە گرنگيەكى وەهاى نەبێت بۆ يەكلاييكردنەوەى دۆسيەكە. دەيپرسى: چۆنت زانى كە لەم شارەدا لەدايك بويت؟ كێ دەناسيتەوە لەم شارەدا؟ بەبيرى تيژى منالێت ئايا كوێت بيردەكەوێتەوە؟ هەستت چييە بەرامبەر ئاپۆراى ئەم خەڵكە كە هەر يەكە لەم هۆڵەدا خۆى بەخاوەنى تۆ دەزانێت ؟ زۆر پرسيارى تر كەبێ مانايیان لێدەچۆڕا، بۆيە عەلى كەمێ حەپەسا. وەك ئەوەى هەموو پرسيارەكان يەك وەڵاميان هەبێت بڵێت؛ جەنابى دادوەر من جگە لەوەى هەر لە سەرەتاى مێردمنالێمەوە كەهەستم كرد من ئەسفەهانى نيم، خەڵكى شارێكى ترو تەنانەت وڵاتێكى ترم. بەڵێ ئەو هەستەم لەلا دروست بوو، غايەڵەم كەوتە سۆراخى ڕاستيەكان. دەربارەى ژيانمو ڕابردووە ناديارەكان. حەزم دەكرد سات بە سات ڕۆژ بە ڕۆژ هەموو ڕابردووم بير خۆم بهێنمەوە، بەڵام دايكە هاجەرم هەميشە لە ژێر باڵى سۆزو ميهرەبانيدا دەيشاردمەوە، وەك شاردنەوەى پەلەوەرێك بە باڵەفش‌و فراوانەكەى تا بێچوە وردیلەكەى بپارێزێت لە مەترسى. تاكە ڕاستيەك كە دڵنياى دەكردم من دەبێ بە شوێن ڕاستييەكدا بگەڕێم

کـەنایزانم ئـەوە بوو؛دایکـە هاجـەرم وەک حەکایەتـە ئەفـسانەییەکان بـۆی دەگێڕامـەوەو هەمیـشەش منـی دەکــرد بــە پاڵــەوانو ئازایــەکی بــەهێزو کەســێکی ئەفسوناوی سەرسوڕهێنەر، بۆیە هـەر لـە منداڵیمـەوە هەستم بە هێزێک دەکرد لـە گیانمـدا. تـا بەرگـەی ئـەو مەینـەتیو ئازارانـە بگـرم، کـە ڕەنگـە لەڕۆژگارێکـی نزیکـدا ڕووبـە ڕووم ببنـەوە. دایکـە هاجـەرم شـتێکی وای لەمێشکمدا چاندبو کە ئیتر من خـەیاڵی ڕوانینێکی چـاوەڕوان نـەکراوبم، کارەسـاتێک کەڕەنگـە سـەراپا ژیــانم ئــاوەژو بکاتــەوە. هەرچەنـد ســەیری تابلــۆ هەڵواســراوەکەی ســەروچرپا ئاســنینەکەم دەکــرد لەژورەکەمــدا کــە شــارێکی نوقمــی ناوژەهرەبــاو دووکەڵی خۆڵەمێشی ببوو، لـە هـەر کوچـەو کۆڵانێکدا خــەڵکانێکی زۆر وەک دیمەنــی فیلمــە ســاماناکەکان هەنـدێ کەس بەدەمـدا پـاڵ کـەوتبوونو هەنـدێکیان لەسەرلاو هەندێکیان هەر بەپێوە لەپاڵ درەختێکی بـاڵا بـەرز، یـان لـەپاڵ دیوارێکـدا بـە پێـوە ڕاوەسـتابونو چاوەکانیـان داخـستبوو، دەسـتەکانیان شـۆڕببونەوەو ڕوومەتــەکانیان بــە دەزولــەی خــوێن نەخــشێنرابون. هەندێ منداڵ لە کۆڵانەکاندا مردبوون و هەندێ منداڵ پەلەوەری جۆراو جـۆری بـاڵکراوی مردارەوەبوویـان

لـەنێو چنگـدابوو. هـەموو درەختـەکانیش لـە وادەی هەڵوەرینو هەندێکیشیان نیشانەیەکی نامۆیان لە سەر گەڵاو لقوچڵەکانیان بە ئاشکرا دەبینرا. چەمێکی تەنگ بـە تەنیـشت شـارەکەدا تێدەپـەڕی، کـەناری چەمەکـە پڕبـوو لـە بۆنـی ناخۆشـی جۆراوجۆر لـەناو قـەوزەو ڕووەکەکانی نـاو جۆگەلەکـەدا سـەدان ماسـی گـەورەو بچـووک بەپـاڵ یەکـەوە مردبـوون. هـەموو ئەمانـە نیشانەی ئەوە بوون لە شوێنێک جا هـەرکوێیەک بێت ڕۆژێ لـەڕۆژان لـە هـەردەمو زەمەنێکـدا ڕووداوێکـی ترسـناک لـە شـارێکدا ڕویـداوەو لـەبیرەوەری ئـەم وێنەکێـشەدا چـۆن ڕویـداوە هـەروا بەزینـدویی وەک خـۆی ماوەتـەوە. زۆرسـەرنجمدا هـەرخۆم بەخۆمـم دەوت؛ ژیان بـە مردوویـی لـەم تابلۆیـەدا نـەک خەیاڵـی هونەرمەندێکی ڕەشبینە، بـەڵکو مەحاڵیشە ڕویدا بێت یان ڕوبدات.

❊❊❊

عەلی هەردوو دەستی لە سەر مێزەکە دانابوو، وەک ئەوەی شاعیرێکی بەهرەمەندو زاڵ بە سەرجەستەو پەیڤو جوڵەو نیگەرانیی خۆیدا قەسیدەیەکی ئاگرین بخوێنێتەوەو دەوروبەری خۆی بهێنێتە جۆش. بەردەوام بوو دەیگوت: ئەو دەمە نازانم تەمەنم چەند خەزانی دیبوو، چەند وەرزی ئومێدم جێهێشتبوو، تەنها ئەوەندە دەزانم هێشتا شەقامەکانی ئەوشارە بە ڕۆیشتنی من نامۆبوون. سێبەری هیچ درەختێکم بیرنایەت. تەنانەت ناوی یەک قوتابخانەی شارەکەم نەبیستبوو نەمدەزانی کڵێساو مزگەوتەکان دەکەونە کوێی ئەوێوە. لاواندنەوەی دایکم یان لاواندنەوەی کاریلەیەک بۆدایکی، یان عەودالّیو سەوداسەری چۆلەکە دایکانەیەکم بیرنایەت بۆ بێچوەکەی، کە لەنێو دەستی منالانی گەڕەکدا هەڵلەرزیبێت. هیچم بیرنایەت، شایەنی گێڕانەوە بێت

تا ئێوە بهێنمە پێکەنین، یان گریانێکی بەکوڵ. من ناوی خۆم لە زمانە گۆنەکردوەکەی دایکمەوە ژنەوت، بەڵام ئەوەی زۆر سەرسامی کردبووم ڕۆژێ لە ڕۆژان جگە لە لایەلایەکی غەمگین گوێم لە سۆزی گۆرانیەکی نەبوو. تادڵنیام بکاتەوە لەژیان. تا نزیکم بکاتەوە لەخۆم. تا دەهات خۆم لە خۆم نامۆترو ژیانیش هەر دوورتر دەکەوتەوە، بە ڕادەیەک هیچ ئومێدێکم نەبوو جارێکی تر دەگەمەوە بە هەنگاوە گەورەکانی ژیان. هەموو ژیانم بەو تابلۆیە دەچوواند کە لە سەرەوەی چرپا ئاسنینەکەم هەڵواسرابوو، بە خەتێکی خواروخێچ وەک کشانی کرمێکی برسی بەزمانی فارسی نووسرابوو "شهر حلبچه شهید". دواتر زانیم شارێکی دوکەڵاوی لە ناو باخچە سێوەکاندا چی دەگەیەنێ. بۆنی سێو لەو باخچە پەژموردەیەدا کە متوربە کرابوو بە مردن منای چی.
عەلی دەدواو بەنیگای چاوەتیژو زیتەکانی دەیڕوانی. وەک ڕوانینی هەڵۆیەکی برسی بۆ نێچیرێکی سرکو وریا. ڕوانینەکانی لە سەر کچە باڵا بەرزە قژ ڕەشەکە هەڵنەدەبڕی. وا لێیدەڕوانی وەک ئەوەی چیرۆکی تەمەنی ڕابردووی تەنها بۆ ئەو بگێڕێتەوەو کەسی تر. ئیتر کەمێ حەسایەوەو هەستی کرد زیاد لە

پێویـست دەروونـی خـۆی یـەکلا کردۆتـەوە، بۆیـە هەوڵیدا تا دەتوانێ خۆی کۆنترۆڵ بکاو چاوەڕوانی دادوەرو تیمە پزیشکیەکە بێت. کە هاتبون بۆ یەکلایی کردنـەوەی ژیـانی عـەلی‌و دۆزینـەوەی خێزانەکـەی. لـەڕێی پـشکنینی تاقیگـەیی (DNA) کـە لەیـەکێ لـە تاقیگاکاندا ئـەنجام بدرێ. عـەلی بێدەنگ دەیڕوانی تـا چـاوی لەسـەر بریـسکەیەک ڕاوەسـتا. کـە تیـشکێکی باریک بوو لە درزی دەرگای هۆڵەکەوە وەک هێڵێکی بـە ئەنقەسـت ئاراسـتەکراو دەیـدا لـە کراسـەگوڵ گوڵیەکـەی کـچە باڵابـەرزە قژدرێژەکـەی ناوهۆڵەکـە. تیـشکەکە ئەکرۆباتیکیانـە یـاری دەکـردو دەگـەڕا وەک گـەڕانی مێروولەیـەک بەشـوێن خۆراکێکـدا، لـە سـەر گەڵایـەکی وەریـو. جـار جـار دەچـووە نـاو قوڵایـی ڕەنگـەکانی نـاو کراسـەکەو، بەشـێوەیەکی نائاسـایی پەلکـە زێڕینەیـەکیان دروسـت دەکـردو جـار جاریـش بەسـەر دەسـتی ڕاسـتیدا شـۆڕ دەبـۆوە تـا دەگەیـشتە سـەر ئەو موسـتیلە زێـڕەی لەپەنجـە سـپییەکانی دەستەڕاستیدا دەبریسکایەوە، دواترسـەمایەکی لەگەڵ جوڵاندنی پەنجەی ئەودا دەکـردو دەگەڕایـەوە قوڵایـی ڕەنگـە زەقـەکانی ناوکراسـە گـوڵ گوڵییەکـە. عەلـی نەیدەتوانی سـەرنج نەداتە تێکـەڵاو بوونـی ئەم تیشکە

که لەسەر پەنجەی ئەو کچە کراس گوڵ گوڵییە ڕەنگاوڕەنگە بوو. چونکە لەهەر چرکەیەکدا هەموو ڕەنگەکان ئاوێتەی یەکتردەبوون‌و هارمۆنییەکی ڕەنگیان دەروست دەکرد. وەک دوو پەلەوەری ئاگرین لە خەیاڵی حیکایەتخوانێکی پیردا کە بیەوێ ئەفسوونی توانای خۆی‌و ئەفسوونی ئەو جوانییە تێکەڵ بکات. عەلی وردو بە دیقەت دەیڕوانی، کچە باڵا بەرزە قژ ڕەشەکەش لەگەڵ ڕوانینەکانی عەلی‌و تیشکە ڕەنگ ڕێژەکەدا تێکەڵ ببوو. عەلی بیری کەوتەوە؛ سەرەتای پاڕانەوەی ناو هۆڵەکەی بیرکەوتەوە "باوکە بمپارێزە لە دووبارە بوونەوەی گوناهەکان. بمپارێزە لەو گوناهانەی کە هەرگیز پاک نابنەوە. تەنانەت ئەگەر ژەمەخوارکی هەموو ئەو دیلە برسی‌و تینوانەش بدەم، کە لەجەنگە جۆراو جۆرەکاندا چاوەڕوانی بەزەیین. یان تەنانەت ئازادی فەراهەم بکەم بۆ هەموو ئەو زیندانیانەی لەسەر نیشتیمانپەروەری‌و لەسەر ئازادی‌و لەسەر مافی ژنان‌و مافی منداڵان‌و مافی بێکاران سزادراون بەمردن". نیگەرانی عەلی بۆ دەوروبەرەکەی جیهانێکی جەنجاڵ و ئەزموونێکی هێندە قوورس و ئاڵۆزی دروستکردبوو. لەلایەکی ترەوە هەموو ئەو ڕوانین و

نیگایانــەی کچــە باڵابــەرزە قــژ درێژەکــە جــۆرە دڵنیاییــەکی تێــدا دەخوێنرایــەوە لــە هــەر لایەکــەوە سەیری عەلی بکەیت یەکێکە لە پارچەی جەستەی ئەم یـان هـەر پێکهێنـەری تـەواوی ڕۆحـی ئـەوەو هەسـت دەکـات لـە هـەموو شـێوەیەک بـە ئـەم تـەنراوە، بـەڵام هــەرچی دەکــرد نەدەگەیــشتە ئــەو بیرکردنەوەیــەی یـەکێک بێـت لـە خێزانەکـەی ئـەو و تەنانـەت خزمێکـی نزیکیـشی. بـە بـەراورد لەگـەڵ کـاتی کارەسـاتەکەدا، تەمـەنی عـەلیو بـاڵاو چۆنێتی برۆکـانیو هـەموو ئـەو تێکــسمڕاویەی تادەهــات دووری دەخــستەوە لــە بیرکردنـەوەی، شـێوەی قـژو ددانـە شاشـەکانی عەلـی هـەر زۆر دوور بـوون، لەسـیماو شـێوەی نـەدەچوەوە سـەر دوورتـرین خزمـی، لەکاتێکدا بـەراوردی سـیماو شـێوەی ئـەوی دەکـرد لەگـەڵ سـەرجەم ئـەو وێنانـەی ئەو هەموو سـاڵە پاراسـتبووی، چ لـەو کـەسو کارەی لەکارەسـاتەدا ژەهـرخنکێن کـراون، یـان لەوانـەش کـە هێـشتا زینـدوون. جـۆرە دڵنیاییـەک لـە گیانیـدا سـەری هەڵـدا کـە پێویـست بەسـەر ئێـشەو لێکدانـەوەی زۆر نەدەکرد.

***

دادوەر هۆڵەکەی بێدەنگ کرد. بێدەنگیەک لەکپی ئێوارانی لاپاڵ شاخێکی پێش خۆرنشین دەچوو. بە بڕیارێکی خێرا وەک بڕیاری دڕاندنی تۆپی پێی تیمێکی منالانی گەڕەک بە دەست دادوەرێکی گۆڕەپانی یارییەوە. تیمێکی پزیشکیی بەهەموو کەرەستەکانییەوە کەوتنەکار، هەموو سەرقاڵ و شلەژاو تا هەرچی زووە دادوەر قایل بکەن بە ئەنجامێک کە دڵنیابن عەلی هەر ئێستا نا ساتێکیتر دەچێتەوە ئامێزی یەکێ لەم خێزانانە. ئەگەرچی کارەکە هەر سەرەتا لە هەوڵی زیندوو کردنەوەی گۆڕغەریبێک دەچوو لە گۆڕێکی تەنگو تاردا، کە کەس نەزانێ هۆی مردنەکەی چییە! جگە لەوەی غەریبەیەک مردووەو هیچی تر. دادوەر دەیویست کاتی خوێن بەخشینی ئامادەبووندا جۆرێک تەبایی لە نێوان خۆی و تیمە پزیشکییەکە لە لایەک و

ئامـــادەبووانی هۆڵەکـــەو عـــەلی هێـــشتا غەریـــب لەلایـەکیترەوە درووسـت بکـات. ئـەم کـارەی دادوەر ڕێک لە گۆرانی گوتنی ئامێردێک دەچوو کە دەتوانین گـوێ لـە بیـستنی بگـرین، بـەڵام نـاتوانین لـە شـێوەو شـــمایلیدا بـــەهیچ جۆرێـــک هەســـتی پێبکـــەین. ئەو دەیویـــست تیمەکـــە بـــەخێرایی کارەکـــەی خۆیـــان تەواوبکەن و خوێن لەهەموو ئامادەبووان بە گەورەو بچـــوکەوە وەربگـــرن. دادوەر ڕووی لەیـــەکێ لـــە ئامـادەبوان کـرد کـە پیـاوێکی تەمـەن سـەرو پەنجـا ساڵان بوو، پیاوێکی قژ ئاڵۆزکاو هـەژارو چاوەڕوان دەهاتە پێش چاو، بەڕیشە سپیەکەیدا دەچووە سـەر پیـاوێکی ئـاینی نیگـەران. ئـەو پیاوانـەی کـە ئـەمڕۆ پەیمانێک دەدەن‌و پاش تاوێکی تر پەشیمانن لێی. یان تاوێـک پرسـیارێک دەکـەن‌و چـاوەڕوانی وەڵامەکـەی ناکـەن، هـەر خۆشـیان وەڵامـی پرسـیارەکەی خۆیـان دەدەنەوە. وەک ئەوەی بیستویانە یان دەیزانن. بەوەی چاوی بە هەر چوار لادا دەگێڕا، هەر بە چاو بـە هـەر چوار پەل سەمای دەکرد لە شتێک دەدوا کە بەڕاستی بـزری کـردووەو دەیـەوێت بیدۆزێتـەوەو نەیدەزانـی چۆن سۆراخی بکات. ئەگەرچی ئـەو یـەکێک بـوو هـەر دوای کارەســـاتەکە لەهـــەوڵ و گەڕانـــدا بـــوو بـــۆ

دۆزینەوەی ئەندامانی خێزانەکەی، شتێکی وای چنگ نەکەوتبوو شایەنی باسکردن بێت، تەنانەت زۆربەی شارو گوندو شارۆچکەکانی ئەودیو سنووریش گەڕابوو. ناوی تۆمارکراوی ژەهربارانکراوەکانو تەنانەت ژەهربارانەکراوەکانیشی بینیبوو نائومێدبوو لەدۆزینەوەیان. ئەو پیاوە هەموو کێلی سەر گۆڕە بەکۆمەڵە کانی چەندەهاجار خوێندبۆوە. ئیتر وای لێهاتبوو بەشوێن گۆڕە بێ کێلو بێ ناسنامەکاندا دەگەڕا، هەمیشە دەیگوت: بڕواناکەم ئەوان مردبن یان بە شتێکی وا دڵخۆشی خۆی دەدایەوە هەمیشە دەیگوت: مردن بەدەست بەندەی خوا نیە بەڵکو بەدەست خۆیەتی خۆی.

***

مـن نـاوم سـەید وەفـای عەبابەیلێیـە بەبنەچـە دەچمـــــەوە سەرســــیانزە مــــاڵەی هەڵەبــــجە کە بەدامەزرێنەرو ئاوەدانکەرەوەی ئەم شـارە ناسـراوین. من لەماوەی گەڕانمدا بەشوێن کچو کوڕێکی ونبومـدا لەکارەســــــاتی ژەهربــــــارانکردنی شــــــــارەکەدا، بەخەستەخانەکانی هەموو شارەکانی ئەو دیو سنوردا نامەیـەکی دوور و درێـژم لـە پەرسـتارێکی دڵـسۆزی یەکێ لە نەخۆشخانەکان دەست کەوتووە کە پیاوێکی بەتەمـەن بـە لەشـی مانـدوو برینـدارەوە بـە ماوەیەکـی زۆر کـــە ماندوویـــەتی بـــە نامەکەیـــەوە دیـــار بـــوو نوسیویەتی کەوەک وەسیەت نامەیـەک پێش ئەگـەری مردنی خۆی کەدواتر لەبەر زۆری خـەڵکی بریندار بـە چـــــەکی ژەهـــــراوی کەزۆربەیـــــان لەبەر ســــــەختی برینەکانیان مردبوون ئەم پیاوەش چارەنوسـی نادیـار ماوەتـــەوە. لەسەرپـــشتی نامەکـــەش نوســـراوە تکایـــە

هەرکەسـێ ئـەم نامەیـە وەردەگرێـت بیگەیەنێتـە دەسـتێکی دادپـەروەر تـا وەک بەڵگەیـەک بمێنێـت بـۆ ئەوانـەی لـەڕوودانی ئـەم مەرگەسـاتە دوودڵـن یـان تائێستا دڵنیانین چونکە هەمیشە زۆردارەکان مێژووی قوربانییەکانیان لەبەرژەوەندی خۆیان نووسیوەتەوە. نامەکە لەوە دەچوو زۆرتر بێ لەم چەند لاپەڕەیەی گەیـشتۆتە دەسـت سـەید وەفـای عەبابـەیلێ. بەوەی لـەکۆتایی زۆر لاپەڕەیـدا پەیوەندیـەکی قوڵـی نیـە بەلاپەڕەی دووایی خۆیەوە لەگـەڵ ئەوەشـدا دەست و خـەتی ئـەو کەسـەی نامەکـەی نووسـیوە دیـارە چەنـد ماندوو بووە ، بەوەی لە هەندێ شوێندا گومـان لـەوە دەکرێـت بـۆ ماوەیـەک لـە نوسـینەکەی وەسـتابێت و پاشـان دەسـتی کردبێتـەوە بەتـەواو کردنـی نامەکـەی. هەموو ئـەم گومـان و نیگـەرانیی و ئەگەرانـە نیشانەی ئـەوەن کارەسـاتی نووسـراوی نـاو ئـەم نامەیـە زۆر کەمـە لـەچاو کارەسـاتە گەورەکـەدا. کەژەهربارانـی شارێکە لەوەش گرنگتر شـارێک لـە نێوان دووجەنگی گـەورەی کۆتـایی سـەدەی بیـستەمدا کـە بەسـەدەی جەنگـە گـەورەکان ناسـراوە. ئـەم شـارەش جگـە لـە بێلایـەنی لـەم جەنگـە مێژوویـەدا قوربانیـەکی تـرە کـە هەمیـشە ئەوانـەی نایانـەوێ لایـەنگری خوێنڕشـتنی

خـەڵکی تـربن زۆرجـار خۆیـان پێـش خـوێن ڕێژیەکـە دەبـن بـە قـەرەبرووت‌و قوربـانی. بەگـشتی نامەکـە کورتەیـــەکی بچووکـــە لـــە گێڕانـــەوەی بەســـەرهاتی خێزانێکی چەند کەسیی کە هەر خێزانێک لـەو شـارەدا ڕەنگە چیرۆکی کارەساتی تریـان هـەبێت، وەکـو چۆن لەجەستەی قوربانیەکان دەیان گۆڕی بە کۆمـەڵ هەن، ئاوهـــاش دەیـــان گـــۆڕی بەکـــۆمەڵ لەچـــیرۆک و بەســـەرهاتی سەرســـوڕهێنەری خەڵکـــی ئەو شـــارەدا هەن بێ ئەوەی کەس چەپکە گوڵێ بنێتە سەر یادگارە تاڵەکانیان.

ناوەرۆکی نامەکە:

"گرنـگ نیـیە مـن کێـم. پیـاوێکی بـاڵا بـەرز یـان کورتە باڵا یان هەرهیچیان نیم. وابزانن من سۆفییەکی کونجـــی خانەقـــا یـــان ئیمانـــدارێکی نیگـــەران یـــان هـــەرهیچیان نیـــم. گرنـــگ ئەوەیـــە دەزانـــم مـــرۆڤم‌و شایـستەی ڕێـزم نـەک بـەزەیی. مـن لـەم نامەیـەدا ئارەزوو ناکەم تەنها باس لە دەردەسـەری خێزانەکـەم بکەم، بەڵکو دەمەوێت باس لە چۆنێتی مەرگی شارێک و قوربانیـــەکانی بکـــەم. ئێمـــە دانیـــشتووانی شـــارێک بـووین چەنـدە دەسـتەمۆ بـووین بـە ژیـان، هێنـدەش یـاخی بـووین لـە مـردن. ئـەو مردنـەی جەنگـەکان

ناوزەدیـان دەکـەن بـە پـیرۆزی، مـردن لـە پێنـاو نیشتیمان و پیرۆزییەکانی نیشتیماندا، شارەکەمان لە نێوانی دوو بەرداشی گەورەدابوو، بەرداشی جەنگ کە مرۆڤی وەک دانەوێڵە دەهاڕی. جەنگی کۆتایی سەدەی بیست، کە دەستپێکردن‌و کۆتایی ئەو جەنگە تەمەنێکی دورو درێژ بوو ڕەنگە نەگاتەوە بە کەمەری بیرەوەری باڵای ئازاری کەسمان، جەنگی نێوان هەردوو وڵاتی عێراق و ئێرانی دراوسێ. جەنگی نێوان تێکەڵ کردنی ناهەقیەکان‌و پێشێلکردنی گشت جوانیەکانی مرۆڤ. لەو جەنگەدا ئێرانیەکان ئێراقیەکانیان بە زەندیق و لادەر و خوانەناس ناساند بەدنیا. جەنگاوەرەکانیان هاندەدا کلیلی دەرگای بەهەشت بکەن بە مەدالیاو لە ملی بکەن، دوا هەناسە بکەن بە دوو پارچەوە نیوەی هەناسەی سەرەمەرگیان لەسەر زەوی بەجێ بهێڵن و نیوەکەی دی بگەیەنێتە دەرگا چاوەڕوانەکانی بەهەشت. ئێراقیەکان ئێرانیەکانیان بە میکرۆبی سەدەی بیست‌و لادەرەکانی ئایین و زمانی پیرۆزی قورئان دەزانی. هانی جەنگاوەرەکانیان دەدا وڵات لەئافاتی ئەوان دوورخەنەوەو زەوی لە ڕیشە درێژوو عەمامە قوچەکانیان پاک بکەنەوە. جەنگ وابوو. شارەکەی

ئێمە لەنێوان ئەو دوو بەرداشەدا دەنکە گوێزێکی گەورەبوو. هەریەکێکیان بەهەموو هێزیان چەکوشی سەرکەوتن‌و دۆڕانی خۆیان پیادەکێشا. شارەکەمان لە نێوان زمانی عەرەبی‌و زمانی فارسیدا لە کەروێشکێکی ڕاکردووی بەر تفەنگی دوو ڕاوچی بێویژدان دەچوو. کە هەردووکیان بیانەوێ لە ڕاوکردنی ئەو کەروێشکەوە فێری نیشانە گرتن بن لەیەکتری. لە ئاسمانی شارەکەمان هەمیشە ژمارەی فڕۆکە شەڕکەرەکان لە ژمارەی چۆلەکە زارەترەک و تەریوەکان زۆرتر بوون. ژمارەی ناپاڵمەکان لە ژمارەی خانووە کاولەکان زیاتر بوون لەو شارەدا دڵنیایی ڕەوە ماسییەکی تەریو بوو لەگۆمێکی ئاو لێبڕاوی گومان‌دا. فڕۆکە جەنگیەکانی ئێران هەڵدەهاتن و فڕۆکە جەنگیەکانی ئێراق بۆمبێکیان تێ دەگرتن و پێش ئەوەی فڕۆکەکان خۆیانیان لێ بدزنەوە بۆمبەکان دەکەوتنە سەر بانیژەی ماڵێکو لە کۆلانەکاندا جۆگەلەی خوێنێکی تازەیان دروست دەکرد. جارێکی تر فڕۆکە جەنگیەکانی ئێراق ڕایان دەکردو فڕۆکە جەنگیەکانی ئێران بەگولەو شەست تیر دوایان دەکەوتن. یان پێش ئەوەی فڕۆکەوانەکانی عێراق هەست بەدڵنیایی بکەن‌و گۆڕەپانی جەنگە

ئاسمانییەکە جێی بڵێن دەیان ڕێبواری بێ ئاگاو دەیان منداڵی ناو بێشکە لاشەیان تێکەڵ بە پارچە گوللەی گەرمی فڕۆکەکان دەبوون. لە نێوان ئەم جەنگە ئاسمانی و زەمینییەدا ئەندێشەیەک کەوتە بیری سەرکردەی ژێر سێبەری دارخورماکانی بەغداوە. کەوەک مێش و کوللە و ئافاتی زەوی گیانلەبەری نێوان جەنگەکە لەناوبەرن بەجارێ شارەکەمان لەو زیندەوەرانە پاک بکەنەوە، بەمرۆڤ و ئاژەڵ و پەلەوەر و سەوزاییەوە. بێلایەنی شار لە ژێر پێی جەنگە ڕق ئەستورەکەدا بکەن بە شوێنی مردن و وێرانە. تا دوژمن بە هەموو هێزی مەرگی خۆی بەسەر هێزی ژیاندا بانگەواز بکات. بەتایبەتی بۆ شارێک کە بەمیکرۆبی کوشندە دەناسرا ئەو میکرۆبانەی کە هێشتا زاناکانی جیهان جگە لە مەترسی گەورە هیچی تری دەربارە نازانن. من لەم نامە کورتەمدا کەوەک شکایەتی خەزانی گەڵایەک لە درەختێکی پیری چەند ساڵە، ئەم چیرۆکەتان بۆ دەگێڕمەوە. من هەڵبجەییم ئەوەی لەبیرم مابێت لەچیرۆکی هەوڵی دەربازبونی خێزانە بچکۆلەکەمتان لەژەهرەبا بۆ دەگێڕمەوە. کە ڕەنگە هەر یەکێک لەوان ئێستاکە لە سوچێکی بیمارستانێکدا بیرەوەری خۆیان

بۆ ئێوه بنووسنه‌وه، یان ئێسقانی هه‌ر ئه‌ندامێکی جه‌سته‌یان به‌ده‌م قه‌ل و داڵه‌وه بێت بیخۆن. من نازانم . . . ڕۆژانی دوایی نه‌بێ که ڕه‌نگه من پێش ئه‌وه‌ی نوشدارێکی به ویژدان په‌لکێشم کاته‌وه بۆ ژیان. بمرم‌و به نووکه بێڵی جوتیارێک بچمه‌وه ناو نهێنیه‌کانی ژێر زه‌ویه‌وه. چیرۆکه‌که‌ی من له‌و ساته‌وه ده‌ست پێ ده‌کات که فڕۆکه باڵ گرتوه‌کانی به‌غدای پایته‌خت به هه‌موو بیره‌وه‌ریی و مێژووی بیابانه‌کانه‌وه به‌ئاگادارییی هه‌موو سه‌رکرده‌و خه‌لیفه‌و والی‌و مه‌لیک‌و خانه‌کانی جیهانه‌وه به سروودی تۆڵه له دوژمن که وشه‌کانی شاعیره‌کانی جه‌نگ نووسیبویان هونه‌رمه‌نده‌کانی جه‌نگ ده‌یان چڕی و کۆرسه‌که‌ی سه‌دان هه‌زار خه‌ڵکی هه‌ژار و به‌شمه‌ینه‌ت ده‌یانوته‌وه. هاتن وه‌ک گای ڕه‌ش، هاتن که کاتێ دیلێکی بریندار به کراسی خوێنینه‌وه ده‌که‌وێته به‌رده‌ستیان ئه‌وان ژماره‌یان له ئاسماندا له ژماره‌ی په‌نجه‌ی ده‌ست‌و قاچی مرۆڤێکی ئاسایی زیاتر بوو. هه‌ندێکیان ڕه‌نگیان له قرشه زه‌به‌لاحه‌کانی زه‌ریا گه‌وره‌کان ده‌چوو. کاتێک په‌لاماری سه‌رنشینی که‌شتیه‌کی شکست خواردوو ده‌ده‌ن. هه‌ندێکیان سپی و زه‌یتونی ئێمه ده‌مانتوانی بیان بینین ته‌نها ئه‌و

کاتانـە نـەبێت تیشکی خۆرە ئاڵتونیەکە بـازد بازدێنـی لەگەڵــدا دەکــردن تاپیــشانی نیگــەرانی و شــڵەژاوی ئێمەیان بدەن. هەموو ئاسمانیان تەنی بە جاڵجاڵۆکـەی خەیاڵێک کە هیچ کەسێک نەیدەتوانی لەخەیـاڵی پەرش و بـڵاوی خـۆی دایمـاڵێ، سـەرەتا وەک ئـەوەی ئـەوان هـاتبن منـداڵانی ئـەم شـارە ژێـر بکەنـەوە لـە گریـان. داوای لێبـوردن لـە خـەڵکی بکـەن، تاچـاو تـێربوو لـە بینین هاتنو چوون، تا گوێچکە تێربوو لە بیستن هاتن و چــوون، بــە ئەنـدازەی هــەڵهاتنی مانـگ لــەو دیــو کێوێکـەوە تـا ئـەم دیـو ئاسـۆگەی ڕوانینمـان بڵاوەیـان لێکرد. نزیک بوونـەوە لێمـان، دوامـان کـەوتن، پێشمان کــەوتن، لەگــەڵ هەنگاوەکانمانــدا ڕۆیــشتن، لەســـەر سـەری خەیاڵی هـەر یەکێکماندا قسـەیان دەکـرد و ئێمـە لەبـەر هـاڕەی دەنگـی ئـەوان نـەماتوانی هیـچ ببیستین. وەک سامناکیی یـاری بـاوکێکی تـوڕە لەگـەڵ منداڵێکـی لاسـاردا. هاتنـە خـوارەوە ژمارەیـان بەقـەد ژمـارەی تیمێکی ڕاوچی دارستان بوو. هـەر هـەموویان لـە یـەک کاتــداو پێــکەوە هاڕەیــان لـــە شوشــەی هـــەموو پەنجەرەکانی شار هەستان. هاڕەیان بە شوشـەی دڵـی هـەموو دانیشتووانی شـار کـرد. دەرگـاو دەروازەکانیـان شـکاند، ژیانیـان لـە گرێژەنـەبردو ڕۆیـشتن. ئەوەنـدەو

دوای چەند چرکەیەک هەرهێندەی دەمو چاوشتنی بەیانیانی پیاوێکی تەمبەڵ. بەقەد ژمارەی دەستو قاچی مرۆڤێکی کەم ئەندام فڕۆکەی ڕەنگ ئاڵتونیوخۆڵەمێشیو ڕەنگ زیوینو هەموو ئەو رەنگانەی کە هەر وڵاتە و بە ئارەزوی سەرمایەدارێکی زەوق سز ڕەنگ کرابوون. هاتن هەر هەموویان بوون بە پاسەوانی با هەڵکردووەکانی ئاسمان، شوێن پێی باکانیان هەڵگرت، لەگەڵ ڕێڕەوی باکەدا دەڕۆیشتنو نامەی جۆراو جۆریان دەدایە دەست با. کە تێیاندا دەیان شیعری جاهلی و، حکایەتی شەڕی کۆچەریەکانی سەحراو تەنانەت بەسەرهاتی کەنیزەو غیلمانی خەلیفەی ئەوسای پایتەختی تێدا نوسرابوو. بە ئاشکرا (با)کان ڕێگای مردنیان پیشاندان نامەکان بەدەم باکانەوە سەمایان دەکرد، سەمایەک کەلەپێکانی لەناکاوی مەلێکی کێوی دەکرد کە بە باڵی شکاوەوە پێش ئەوەی کەوتبێتە سەرزەوی. ئەوان تەنها ئەوەندەیان لە سەربوو. نامەکان بدەنە دەست با ئیتر لە نێوان فڕۆکەوانەکان و (با)کاندا، لە نێوان باکان و پایتەختدا، لە نێوان پایتەخت و فڕۆکەکاندا ڕاوێژکرا. هەر ئەوەندەی پیاوێکی میهرەبان توڕەبێو پەشیمان بێتەوە لە

تورەیی، شار وەک نەخۆشێکی بێزار لە ڕووناکی، خۆی لە جاجمێکی خۆڵەمێشیەوە ئالاند. پێچەوانەی نەخۆشێک کە نرکەو ناڵەو هاواری دەگاتە هەموو شوێنێک، کە پەرستارێک نەبێت هەتوان بخاتە سەر زامە بەسوێکانی جەستەکەی ناڵەو هاوار تا دەهات خامۆشتر دەبوو. تا دەبوو بە نوزەیەکی شەرمن دواتر وەک چرایەکی بێ نەوت هێواش هێواش دەکوژایەوە. سەرەتا هەروەک بە زۆر پچڕاندنی ملوانکەی گەردنی گەورە کچێک بەدەستی سەربازێکی داگیرکەر مەل و موور و باڵندەی ئاسمان پێکڕا هەڵوەرین. درەختەکان خۆیان لە پۆلە چۆلەکەو پۆلە کۆتری هەڵنیشتوی نێودارسنەوبەرەکان تەکاند. وەک دابارینی بەردە فڕکێی کۆمەڵێ منداڵی چەتون بۆ درەختێکی پڕ هێلانەی بالابەرز. ڕەنگی سەوزی بەهاری شار گۆڕا بەڕەنگی مردن. با جۆلانەی بە پەنجەرەی کراوەو دەرگای والاو لێکترازاوی ماڵەکان دەکرد. دەستی تێکەڵی پیاو و ژنەکان لێک جودابوونەوە. گۆچانی دەستی پیرەکان کەوتنە خوارێ تەشی و تیرۆکی دەستی پیرێژنەکان لە پەنجەکان وەستان. باکان چاوشارکێیان لە پاڵ تەپۆڵکە گردە نزمو شێدارەکاندا دەکردو کلاوی

لوتکەیان دادەگرت. گوێی ئەشکەوتیان بە شەونم دەئاخنی، ژەهرەباکان پێ دەکەنین، لە نێوان گریان و پێکەنیندا شتێک نەبوو کە بیزانین. عاشق هەبوو خەیاڵی توڕدابوو تەنها هەر پێدەکەنی. منداڵ هەبوو دایکی بیرچووبۆوەو پێدەکەنی، ژن هەبوو چاوەڕوانیی خێزانەکەی بیر چووبۆوەو پێدەکەنی، ژەهرەباکان مردنیان ژیانیان هێنایە پێکەنین ژیانیان پڕ کرد لەگریان. بە ئەندازەیەکیش پێدەکەنین گەورەو بچووک بە پێکەنین پێشوازی ڕەشبەڵەکێک لە مردن بکەن. وەک ئەوەی مردن خۆی جۆرێکی تربێت لە درێژکردنەوەی ژیان. بە پێکەنین پاڵیان دەنا بە یەکترەوە تا دەگەیشتنە دوا سەرچۆپی کێش و گاوانی. ڕیزیان دەبەست بۆ مردن، وەک ڕیزبەستنی باڵندە بێئاگاکان لەژێر ئامێری سەربڕینی قەسابخانەکان هەر لەوێدا لە نێوانی پێکەنین‌و گریاندا، بەپاڵ جەستەی مردنەوە دەستی ژن قرتێنرا بوو کە هێشتا پەنجەکانی لە ژماردنی فڕۆکە بۆمب هاوێژەکان سارد نەببونەوە. باڵ هەبوو بە تەنها هێشتا بۆنی بازنگ‌و خڕخاڵی ئالتوونی لێدەهات. گەردن هەبوو دەزوولەی خوێن شوێن پلپلەو گەردانە ئالتوونییەکەی سواغ دابوو. گوێچکە هەبوو هێشتا

هەستت بە لەرینەوەی گوارە زێڕە دزراوەکانی دەکرد. قاچ هەبوو شوێن پاوانە ئاڵتوونییەکانی تێدا نەخشێنرابوو بە قرتاوی. بۆنی پیاو لە هەندێ قۆڵ و باسکی تووڕدراوی ژن دەهات. لەوێ بەشە مردووەکەی گیانی مرۆڤ زیندوو دەبۆوەو وەک گەلە گوورگ دەی لوراند. بەشە زیندووەکەی مرۆڤیش دەستەوستان هۆن هۆن دەگریاو هیچیتر. مەرگ پەیکەرێکی ئاسنین بوو، پێدەکەنی! قووڵتر بتڕوانیایە ئەویش پێنەدەکەنی، بەڵکو شێوەی کەڵبەکانی دەچوونەوە سەر پێکەنین. لە دوورەوە تارمایی مەرگت دەبینی بانگی دەکردین ناوی یەک بەیەکمانی دەزانی. دەستی دەهێنا بە سەرمانداو بۆنی دەکردین تا خۆشمان بووێت کەڵبەو پشکۆی چاوە داگیرساوەکانی بۆنی عەتری سێوی مەرگی لێدەهات. ئێمە چوار کەس تەنها چوار گەڵای ڕاکردووی درەختی پەژموردەی خێزانەکەمان تەنها چوار گەڵای سەوزو هیچیتر، نەمانزانی خەزانی ژەهرەبا چەندی لێ هەڵوەراندوینو چەندی لێ هەڵبزرکاندوین، چەندیشی زارەترەک کرد، چەندیش بەدرەختی مردنەوە خۆی هەڵواسی. منو ژنەکەم پێکەوە دەستی ماندوی یەکترمان دەگرتو کچو کوڕە ناوەنجییەکەم

هەردووکیان پێکەوە کەشکۆڵێ پرسیاریان خسبووە سەرشانیان، دەیانویست بیدەنە دەست ڕێبوارێک ماندوویەتیان بحەسێنێتەوە. کەسێ نەبوو. . هەرچوارمان بەسەر تەرمی جۆراو جۆردا هەڵهاتین. بەسەر سەدان هاواردا بازماندا بڕۆین، هەزاران باڵە فڕێی مردنمان جێهێشت بەتەنیا. زۆر نەڕۆیشتین هێشتا خونچە نێرگزی دەرکردووی ناو سەرمان نەگەشابۆوە. هێشتا نەگەیشتبووینە ترۆپکی خەیاڵێک هەموو دانیشتوانی شار ببینن چەند لە دوا ئێمەوە دەمرن، هێشتا هەر سەرەتابوو سەرەتای مەرگی بە کۆمەڵ.

به هەر چوارلادا دەمانڕوانی، (با)کان نۆکەرانە لە پێش فڕۆکەوانەکانەوە دەڕۆیشتن. هەندێ جاریش فڕۆکەکان بەشوێن (با)کاندا دەگەڕان بۆمبێکیان دەگرتە شوێن پێکانی با، کاتێک دەیانزانی(با)دەیەوێت خۆی تێدا حەشاربدات، ژیان فریای داوای لێبوردن لەکەس نەکەوت، مەرگیش فریای داوای لێبوردن نەکەوت لە ژیان. دەڕۆیشتین بە پەلەپەل هەندێ جار خاو و هەندێ جار دوو باڵمان دەخواست هەڵفڕینو دوورکەوینەوە لەشار. دواجار (با)کان ئێمەیان ناسیەوە بە کوڵەباڵ و ڕانکو جۆغەکانمانەوە

ناسـیانینەوە، بـە هەناسـە مانـدوەکانمانو شـڵەژاوی هەنگاوەکانماندا ناسیانینەوە.

هەسـتمان بـە ئازادییـەکی کورتخایـەن دەکـرد. وەک گێژەنی ڕەشەبا زەبەلاحەکان، ئەو ڕەشـەبایانەی بیابانێک دەکەن بە دوکەڵ شـارێک دەکـەن بە بیابـان. پێچـاو پێـچ هـاتن، هـەرچی لمـی ڕوبـاری سـیروان و ووردەبەردی ئـەو شـاخانەبوو هێنایان. لـە هـەر چـوار لاوە پەلاماریاندایـن، چون پەلاماری گێژەنی دەریایەکی هـەڵچوو لەبێ ئاگایی پۆلـە ماسـییەک. نـەمان دەزانـی کەوتوینەتـــە کوێـــی گـــۆی زەویـــەوە، نەماندەزانـــی شـــارەکەمان دەکەوێتـــە کوێـــی هەنگاوەکانمانـــەوە، بـــەرپێکانمان پـــڕ بـــوو لـــە پەلـــەوەری کـــوژراو. کە زووربەیان ئەو پەلەوەرە دەگمەنـانە بـوون کەتەنها لە پێدەشـتەکانی ئەو شـارەدا دەژیـان و لەسەرانسـەری دونیادا نەماون و ڕەچەڵەکیان بڕاوەتەوە. چاوەکانمـان تـا دەهـاتن دەکزانـەوە وەک ئـەو منالـە هەژارانـەی تـا درەنگـانێ لەبرسـا دەگـرین و خەوناچێتـە چاویـان. گوێچکەمان پڕبوو لـە دەنگی نـامۆی وا هـەرگیز پێش ئەوسا بەر گوێمان نەکەوتبوو، هەستمان دەکرد ئێستا دنیـا دەبـێ بـە تۆفـان شـاخەکان دادەڕمێـن. ڕێگاکـان کوێر دەبنەوە، ئاسمان دادەبەزێتە سەرزەوی، ئێمە لـە

نێوان ئەو هەموو دارِمانو هەرەسە گەورانەدا دەبین بە زوخاڵ. (با)کان ناوسکیان پڕبوو لە ژەهر بە لوورە لوور وەک گەلە گورگێکی برسی پەلاماریان داین، هەرهێندەی ئەم دوو دێڕەم نوسی یەکەم جار ژنەکەم بوو بە نێچیری ئەو، وەکو چۆن ڕاوچییەک بەخت یاری بێت هەر سەرەتا قولاپی مەرگ لە قورگی ژنەکەم گیربوو، هاوارمان کرد ئەی مەرگ نەکەی، چیمان کردووە بۆ وادەکەی، ئەی مەرگ بەڵام سوودی چییە ئاسمان کەڕ بووبێت و زەوی کوێر بوبێت. دەنگمان لە ناو گێژەنی (با)کاندا تادەهات زیاتر دەتاسا. دەنگمان سنووری گەرووومانی تێ نەدەپەڕاند، زانیم لەنێوان ژەهرەباو شیرینی ژیاندا تامێکی ترنیە بۆچەشتن، جگە لەوەی چاوەڕوانی قەدەربین بزانین چی دەکاو هیچیتر.

بیرم کەوتەوە ئەو قورئانە پیرۆزەی لە باخەڵمدا بۆ سەلامەتی خۆمو خێزانەکەم هەڵمگرتبوو دەرمهێنا، لاپەڕەی سورەتی یاسینم کردەوە، پەنجەم خستە سەر یەکەم دێڕی سورەتەکە ...

(**يس. وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ. إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ.** )

کچەکەم وەکو خۆی لەدەستی مەرگ ڕاپسکێنێ دەستی گرتم پەنجەی شایەتمانی بۆ شکاندمەوە،

بەدەستە بێهێزەکانی کە وەک شۆڕەبی دەلەرزین دەستەکانمی دەگوشیو بەری نەدەدا، هەوڵی دەدا بەرینەدا. نەوەکو من سورەتەکە تەواوبکەم. ئەو لە مردنو خوێندنی سورەتی یاسین دەترسا، چونکە بەگوێی خۆی گوێی لێ بووەو دەیزانی هەموو مەلاو ئیمانداره خوێندەوارەکان کاتی گیانەڵای دەیان پیرو نەخۆشو پەککەوتە ئەم سورەتەیان خوێندووە. نیشانەیەکە بۆ پێش مردنو پاککردنەوەی گیانە لە گوناه. کچەکەم سەری خستە سەرسنگی دایکی دەیویست هەرچی زیاتر هەڵکشێو بە تەواوی باوەشی پێدابکات. دایکی هێشتا هۆشی لە دەست نەدابوو کەساسو بێدەسەڵاتانە دەیڕوانی، لە ناکاو دایە پڕمەی گریانو ژەهرەکە لە دەمو گوێچکەو لوتو لە هەموو جەستەی دەتکا.

هەردووکیان باوەشیان بەیەکدا کرد، ئیتر زانیم کارمان تەواوە. وەک ئەوەی مردن چنگی لە قژی کچەکەم گیرکردبێ ئەویش خۆی لە مردن ڕادەپسکان، ئیتر هەردووکیان وەک بڕیار بدەن پێکەوە بمرن دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوە، چاوەکانیان بڕیە ناو چاوانی یەکتری، باڵایان پێکەوە جووتکرد، باڵای کچەکەم یەک دوو قولانج لە دایکی

درێژتر دەینواند بەبێ دەنگی لێم دەڕوانین و هیچیشم پێ نەدەکرا. تا هەردووکیان وەک دوو کلوبەفر تێکەڵ یەک بوون و بوون بە پارچەیەک سەهۆڵی ساردو سڕ. دڵم نەدەهات بڕوا بە مردنیان بکەم. زۆرم بیستبوو لە حیکایەتی مردنی کتوپڕ، یان حکایەتی مردن بۆ چەند ساتێکو جارێکیتر خۆڕاپسکان لە دەست مردنی نەفرەتی.

بۆیە جارێکی تر قورئانەکەم لە باخەڵم دەرهێنایەوەو کەوتمەوە خوێندنی سورەتی "یاسین" ، ئەو سورەتەی کە گوایە فریادڕەسە و سنوورێکە لەنێوان مردن و ژیاندا یان پاک بوونەوەی ڕۆحە لە هەموو تاوان و گوناهە گەورەو بچووکەکانی سەرزەمین.

**یس. وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ.**

هەر ئەوەندەو (با)کان بە توڕەیی لاپەڕەکانیانی دابەیەکدا. هاوارم کرد؛ هۆ ئێوە پیاو چاکان ئەوانەی پێش مردن مژدەی بەهەشتتان پێدرا، ئێوە ئەوانەی تا شمشێرەکانتان بەخوێنی باپیرە بێ بڕواکانی ئێمە سوور نەبوو. مژدەی بەهەشتتان پێنەدرا. فریامانکەون، نەوەکانی ئێوە دەمانکوژن. وا

ژەهربارانمـــان دەکـــەن. ئێـــوە ئـــەی دارو بـــەردە پیرۆزەکـان. زۆرمـان هـاوار کـرد ئـەوەی یەکجاریـش ناویمان بیستبوو بانگمانکرد بەهانامانـەوەبێن نـەهاتن!. ئیـتر قورئانەکـەم بـە پەلـە خـستەوە باخـەڵمو پەلـی کوڕەکـەم گـرتو هـەردووکیانم جێهێشتو بـە دەنگـی بەرز وتـم: کـەس بەهانامانـەوە نـەهات، کـەس فریامـان نەکـەوت، ئیـتر بـە ئومێدی دیـدار، بـە ئومێدی دیـدار. ئێستە دوو پیـاوی دڵ پـڕ لـە خـەمو قـورگو چـاو و گـوێ پـڕ لـە ژەهـر. ڕامانـدەکرد، وەک دوو کارژۆڵـە بەپەلـە پـەل بـە شـاخ و داروبـەرددا هەڵـدەزناین، بـە چاوێکمان بەرپێکانمان دەبینیو هەڵدەنوتاینو خۆمـان دەگرتەوە . بە چاوەکـەی ترمـان هەمیشە لـە تارمایـی ئـەوانمان دەڕوانـی. هـەنگاوێکمان بـۆ پێـشەوە دەنـاو دووان بۆ دواوە، (با)کان پەلەیان لێکردین، بە پاڵ بـە گۆچانی دەستی مردن ڕاویان دەناین. ئاسمان تاریک، دڵمـان تـاریکتر لـە ئاسمان، بـە سـەر سـەدان گیانـەڵاو لاشەی بێ گیانو بە سـەر تـەرمی هـەزارەها باڵندەو پەلـــەوەری جـۆراو جـۆردا بازدمانـدا. ســەدان نــزاو پـاڕانەوەو هاوارمـان لـە دوای خۆمـانەوە جێهێـشت. کوڕەکەم نەیدەوێرا بـانگم بکـات، نـەوەکو مـردن نـاوی مـن بزانـێ، نەیـدەوت باوکـە نـەوەکو نهێـنی ئـازاری

مردنـــی نێــوان بــاوکو کــوڕ بــەچاوی خــۆی ببیــنێ. تادەهـات مانـدووتر، هـەنگاوەکانمان خـاو دەبوونـەوە، لاشـەمان سسترو ورەمـان تادەهـات بـە پلـەی بانیژەی دیـــواری ژیانـــەوە دەهاتـــە خـــوارەوە. کوڕەکـــەم دەستەسـڕە تەڕەکـەی بـەدەم و کەپـویەوە گرتبـوو. دەینالاند، ئاوڕم دایەوە حەزم نەدەکرد گوێم لـە ناڵـەی ئەوبێت و نەمرم. تا دەهـات ئـەویش وشـەکانی لەسـەر لێـودا دەترازانـد، نەمـدەزانی چـی دەڵـێ، قسـەکانی لـە قسەی کەسێکی تـر دەچـوو، یـان لـە قسـە بزرکاندنێک لــە کــاتی خەوبینینــدا کــە ڕوداوێکــی ترســناکی بــە سـەرهاتبێ. بۆیـە جارێکی تـر قورئانەکـەم لـە باخەڵـم دەرهێنا. بۆنی سێوی نەفرەتـی لـە هـەمووومان دەهـات. بۆنــی ئــەو ســێوەی ســەرەتای کارەســاتی دەرکردنــی مـرۆڤ لـە بەهەشـتی لێکەوتـەوە. حـەزمان لـە بۆنـی زیاتری سێو دەکرد. بێ ئەوەی بزانین ئەم بۆنـە بۆنـی سێوی ژیـانە یـان بۆنـی سێوی مـردنە. دەسـتم خسـتە سـەر یەکەم دێڕی سـورەتی یاسـین وابـزانم یـەک دوو دێڕم خوێندەوە کوڕەکەم بە دەنگێکی تێکەڵاو دەیگوت بابـە نەکـەی مەیخوێنـە بـا نـەمرین. مـادام پێش مـردن دەخوێنـدرێ مەیخوێنـەرەوە بـا نـەمرین، مـن دەمگـوت کوڕەکـەم یاسـین بـۆ پاکبوونـەوەی مرۆڤـە. کوڕەکـەم

وشـەکانی لـە نـوزەی پێـش سـەربڕینی کەروێـشکی دەکـرد. مـن وام دەگـوت و فڕۆکـەکان بـە سـەرمانەوە دەگــەڕان، دەهـــاتن و دەڕویــشتن جــارێکی تــر دەڕۆیشتن‌و دەهاتنەوە.

کوڕەکەم چاوەکانی داخستبوو، وەک ئەوەی لـە بینینی ئەو داڵە ئاسنینانە بێزار بێت.

وتم سوورەتی قورئانەکە دەخوێنم چی دەبێت با ببێــت، وەلــێ نــەمتوانی. هەســتم کــرد چاوەکانــم دەکزێنـەوە قـوڕگم خەریکـە وشـک ببێـت، دەسـتەکانم کەوتنـە لـەرزین، وەک بڕیـاری هەڵنەفڕیـنی باڵندەیەک لەنیــشانەی ناســینەوەی ڕاوچییەکــی شــارەزا چــاوەڕوانیم هــەڵبژاردو و لاپــەڕەی قورئانەکــەم هەڵدایەوە هیچم بۆ نەخوێندرایەوە، چاوەکانم ڕێشکەو پێشکەیان دەکرد. هەستم بە قورسی جەستەم دەکرد. قاچــەکانم خــەریک بــوون ســڕدەبوون، کوڕەکــەم ڕاکێشایە قەراغ ڕێگە گڵەکە، یەک دوو بەردی گەورەو بچـووکم کۆکـردەوە هێنـامن‌و لەسـەر یـەک دامنـان تانیشانەی ئەو بێت ئەگەر مردن بواری ژیانی پێداین. چیاکەی بەردەمم تا دەهات دوورترو لە خۆی بەرزتر لەپێش دەینواند. هەندێ جار خۆرەکە تیشکی دەناردە سەر گاشە بەردەکانی قەد پاڵی چیاکە، بەفری چیاکە

بەتیشکی خۆرە بەهارییەکە دەتوایەوە، وات دەبینی کێویەکە دەگری‌و جۆگەلەی فرمێسک بە قەدپاڵ‌و سەرتاشە بەردەکانیدا دەهاتنە خوارەوە. تەنها کێوەکەم دەبینی دەگریا، لەم سەر زەمینە گەورەیەدا تەنیا چییاکە دەنگی دەبیستین. لەو کاتەدا من ئەو پەندەم بیرکەوتەوە کەدەڵێت:بەدرێژایی مەرگە ساتەکانمان (بەتەنها چییاکان هاوڕێمان بوون) بەتەنها ئەوان پشتیان تێ نەکردین. سەرم خستە سەر دڵی کوڕەکەم، بەڵام لەبەر ناڵەو هاواری خەڵکی دەوروبەر چیم نەدەبیست . ویستم هانایان بۆ بەرم بێدەنگبن تا لە زیندوێتی کوڕەکەم دڵنیابم، نە من هیچم بۆ گووتراو نە ئەوان توانیان ببیستن. چاوم بڕیبووە چاوەکانی کوڕەکەم، وام هەست دەکرد بە چاوەکانی پێم دەڵێ: باوکە بڕۆ راکە. ئاوڕم بۆ دوای خۆم دایەوە بە پەلە هێشتا کچ‌و ژنەکەم بەدەم ژەهرەباکانەوە دەشەکانەوە. سووچێکی لەچکی کچەکەم بەدەم شەڕی (با)کانەوە دەهات‌و دەچوو. ویستم بگەڕێمەوە سەریان، هەوڵمدا نەمتوانی. دەستم بۆ هەڵبڕین تا بزانم دەمبینن، دەمناسنەوە؟ ئەوان بێدەنگ بوون، وەک خەوێکی خۆش بە ئارامی پاڵ کەوتبوون. هەستم بە بەرگری ڕۆحی ژیان دەکرد،

بەرامبــەر بــە مــردن، کاتێــک ژیــان خــۆی دەکەوێتــە مەترسییەوەو ئیدی مردن مانایەکی نامێنێت. تەنها ئەوەنــدە نــەبێت لەســەرخۆ لــێی بڕوانــیو بیرلــە بیرەوەرییــەکانی ڕابــووردووی خــۆت بکەیتــەوە. دەمویست بگریم نەمدەتوانی، هەستم بە دڵرەقی خۆم دەکرد بەوەی بۆچی فرمێسک لەچاومدا هاژە ناکات. ئاگرێک لە سینەمدا نێڵە نێڵ دەسووتا، بە پرتاو دەستی ڕاستم خستە سەر دڵی کوڕەکەم و ویستم گوێم لە چرپەیەک لە شتێکی بێت لە دەنگی ئەو بچێت، هەستم بە هیچ نەکرد جگە لە لێدانی چرکەی کاتژمێرەکەی دەستی نەبێت کە کاتژمێر دوانزەو نیوی پاشنیوەڕۆی شانزەی سێی لێدەدا. هەستامە سەرپێ کە بڕۆم قاچەکانم لەدوام نەدەهاتن، سێبەرەکەم خاو و خلیچک ڕێی دەکرد. هەموو گەڵاو چڵ و پۆپی هیواکانم هەڵوەرین، حەزم دەکرد بگەڕێمەوە بۆ ناو شار تا ماڵ بە ماڵ، کۆڵان بە کۆڵان بگەڕێم ، تا دەهات شار لە پێش چاوم دوور دەکەوتەوە، (با)کان هەموو شتێکیان شێواندبوو تەنانەت تارماییەکانیش وەک مەرگ ڕاوەستابوون، مەرگو ژیانم. لەیەکتر بۆ جیا نەدەکرانەوە.

دڵم بڕوای نەدەکرد کوڕەکەم جێبهێڵم، گەڕامەوە بەردێکی لوسم هەڵگرتو خستمە ژێر سەریەوە و بەردە زبرەکەی ژێر سەریم توڕهەڵدا، هەر ئەوەندەم پێکرا یارمەتی کوڕە تاقانەکەی خۆم بدەم. جارێکی تر بڕیارمدا بڕۆم دوور بکەومەوە، چونکە سنوری نێوان ئێمەو بەرزایی شاخەکان چەند گابەردێکی زەبەلاحو لاپاڵێکی جەنگەڵی بوو، زۆر نەڕۆیشتم ماندوویێتیم سەری چیاکەی لە پێش چاوم دوور دەخستەوە. چەند هەوڵمدا نەمدەتوانی تا دەهاتیش ژەهرەباکە کاڵ دەبوەوە. ئومێدم لە نێوان شەڕی (با)کاندا وردو خاش دەبوو گەرچی (با)کان دەیانویست پاشەکشە بکەن بڕۆن، لوتکەی شاخەکان هاتن بە پیرمانەوە، سەریان خستینە سەر کۆڵی خۆیان من دڵنیا نەبووم بڕوام نەدەکرد، ئومێدم تا دەهات کاڵتر دەینواند.

جارێکی تر قورئانەکەم لە باخەڵم دەرهێنا تا یاسینی خۆم بخوێنم هەرچیم کرد زمانم گوێی نەدەکرد پەنجەکانم ئۆقرەیان لێ بڕابوو. چاوەکانم هیچیان نەدەبینی هەستم بەبێ توانایی هەموو جەستەم کرد ناچار ئیتر ئەوەندەی سورەتەکەم لەبەربوو لە بەرخۆمەوە دەمخوێند.

نـازانم چەنـدم لەبـەربوو، بـەڵام هەسـتم دەکـرد ناتوانم زیاتر بڵێم و وشـەکانم تادەهات وردوو خـاش دەبـوون، هەڵدەوەرین. باران وردەوردە خـەریک بـوو دابکـات، بـەڵام ئاسـمان پەشـیمانی دەکردەوە لـەبارین. (بـا)کان خۆیان لـە ژەهرەکـان جیا دەکردەوە، (بـا)کـان سـەردەکەوتن و ژەهرەکـان دادەبـەزین، ئـاوڕم دایـەوە ژنو کچەکـەم لـە دوامـەوە ڕایـان دەکـرد کوڕەکـەم هـاواری بـۆ دەکـردم. ویـستم بگەڕێمـەوە نـەمتوانی. تەماشام دەکردن نەمناسینەوە ئەوان نـەبوون خەڵکی تـریش نـەبوون ئیـتر نـازانم دەنگەکـە چـی لێهـات، دەنگەکـە بـۆ نـەما! تارماییـەکان چییـان لێهـات نـازانم. لاپاڵەکـە پڕببـوو لـە لاشـەی بێـدەنگی، کـەم نەبـوون ئەوانـەی بـە هێواشـی تێدەپـەڕینو هیچیـان نـەدەگوت، نەیانـدەتوانی هیـچ بڵێـن ئـەوان هـەر هـەموویان هەڵدەسـانەوەو دەکـەوتن، بـە هـەردوو دەسـت قورئانەکـەم بـۆ ئاسـمان هـەڵبڕی، نـم نـم بـاران دەسـتیپێکرد، خـەریک بـوو لاپـەڕەی قورئانەکـە تـەڕدەبوو، بـە تـەواوی بـە جۆرێک بێئومێد بـووم لـە توانای خوێندنەوەی.

هەسـتم بـە بـەزەیی ئاسـمان دەکـرد، تـا دەهـات لاشـەم سستو ماندو و بێهێزتـر دەبـوو. ئیـتر خـەریک

بوو توانای بیرکردنەوەشم نەمێنێ، لەپاڵ گابەردێکا پاڵ کەوتبووم لە ئایندەم دەڕوانی هیچم لێ بەدی نەدەکرد. نە ژیانو نەمردن هیچ شتێک. ویستم هەستم بڕۆم نەمدەتوانی قاچەکانم بەشوێنمدا نەدەهاتن، قورئانەکەم لەسەر گابەردەکە بە کراوەیی بەجێهێشت.

نەمدەتوانی چیتر هەڵیبگرم، بەجێمهێشت بۆ بارانو بۆ ژەهرەباو بیرەوەری کەسێک کەبێ هیوابوو لە ئاسمانو لە مرۆڤ و لە هەموو ئەو چیرۆکە درێژو خۆشانەی هەموو تەمەنی دڵی بە گێڕانەوەیان خۆشدەکرد، بەڵام لەم تەنگانەیەدا فریای هیچی ئەو نەکەوتن. هەستام بڕیارمدا بڕۆم، لۆژە لۆژ ڕێم دەکرد. وەک ڕۆیشتنی بەچکە مراویەک بەناو دڕکە زیدا. هەرسێکیشیانم بەکۆڵەوە هەڵگرتبوو دەمزانی بەجەستە جێم هێشتوون، بەڵام هەڵگرتنی ڕۆحی ئەوان زۆر قورستر بوو لە جەستەکانیان. لەوێ زانیم قورسایی ڕۆحی مرۆڤ چەند لە قورسایی جەستەکەی سەنگینترە.

هەندێجار هەرسێکیان پێکەوە دەستیان بە پشتێنەکەمەوە دەگرد، هەندێ جاریش دەهاتنە ناو سنگمەوە هەندێ جاریش لەناو سەرمدا دەکەوتنە

گلەیی کە بۆچی بەجێیان دەهێڵم. دەڕۆیشتم لەترم دەداو هەڵدەسامەوە. مەست ببووم بە تامی سێوی مەرگ و ژەهرەبای نەفرەتی. لەناکاو چۆلەکەیەک بەتەنها لەبەردەممدا هەڵفڕی ، سەرەتا وادەزانی بەتەنها تارماییەو هیچیتر چاوەکانم هەڵگڵۆفت تادڵنیا بوم خۆیەتی، زیندەوەرە، دەبزوێ، جارێکی تر بۆنی ژیانم کردەوەو بەشوێن فڕینی ئەو چۆلەکە بچکۆلەیەدا خەمە گەورەکانی خۆم بەکێش کردو زانیم ئیتر مەرگ وا لەدوامەوە ئەویش وەک من خۆی بەکێش دەکات. ئەویش ماندووە ئیتر ناگاتە هەنگاوە شێواو خوارو خێچەکانی من. پڕ بەدڵ حەزم دەکرد زیاتر سەیری فڕینی ئەو بکەم نەمتوانی، تا دەهات فڕینی ئەویان دەکرد بە تارمایی. لەوساتەدا مردنو ژیان بۆ من مانایەکی وای نەمابوو تا دڵخۆشبم، تەنها هیوام ئەوەبوو بگەمە شوێنێکو چیرۆکی ژەهراوی شارەکەم بگەڕێمەوە. بۆ ئەوانەی هەست بە قورسایی ڕۆح دەکەن لە سەر دڵ و ویژدانی زیندوویان".

***

عــەلی کوڵــی گریــانێکی بــێ دەنــگ تــەنگی پــێ هــەڵچنیبوو، لــە نێـوان چیرۆکـی ئـەم پیـاوەو چیرۆکـی خۆیــدا هەســتی بــە بیرەوەریــەکی سەرســوڕهێنەر دەکرد، دەتگوت بەسەرهاتی چیرۆکـی نـاو ئـەم نامەیـە کتو مت باس لە ژیانی ئەم خێزانەی ئەو دەکات.

عــەلی دوودڵو نیگــەران لــە تەمــەنی خــۆی ورد دەبـوەوە. نەیـدەزانی ئـەو کـات دروسـت چەنـد سـاڵان بووە، بەڵام لەوە دڵنیابوو پەیوەندیەک لـە نێـوان ئـەمو چیرۆکـی ئـەو پیـاوەدا هەیـە کـە نامەکـەی نوسـیووە و زۆرشتی بیردەکەوتەوە. ئایا ئەمە ڕێکەوتـەیان هـەمان چیرۆکە، کە تێداژیاوەو چیرۆکی خێزانەکەی خۆیـەتی. یان هەموو چیرۆکەکانی ئەم کارەساتە لەو شارەدا لـە یەکتر دەچن. ئەگەرچی لە بـەر سـەختی کارەسـاتەکەو پــــەرشو بــــڵاوی بیرەوەرییــــەکانی نەیدەتوانــــی پەیوەندییـەکی قـوڵ لـە نێـوان خـۆیو بەسـەرهاتەکەدا

بدۆزێتـــەوە. ئـــەوەی زۆر سەرســـامی کردبـــوو، تائێستاش لـە گوێچکەیـدا دەزرنگایـەوە ببیری تـیژی منداڵی دەنگو ئـاوازی بـاوکی بـو. کەسـەر لـەئێواران دەنگی نزاو پاڕانـەوەی بـەرز دەکردەوەو درەنگانیش ئـەو شـیعرانەی دەخوێنـدەوە پڕبـوون لـە سـۆزو میهرەبانیو لە مێشکی عەلیدا چەسپیبوون کە هەرگیز نەیـدەزانی ئـەو سـۆز و ئەندێـشەیە لـە کوێـوە سەرچاوەی گرتووە. و باوکی دەیەوێت چ چیرۆکێک بگێڕێتەوەو بەکێ سەرسامە یان لەکێ دەترسێ وا بەسۆز ئەندێشەی خۆی خاڵیدەکاتەوە.

***

ئـەو لـە هیـچ دڵنیـا نـەبوو. بـەجۆرێک نیگەرانیـی تــەنگی پێهــەڵچنیبوو، بــڕوای بــە دڵنیــایی نــەدەکرد. تەنانــەت ئەگــەر هــەموو ســەرەداوەکانی پەیوەنــدی تەواوی ئـەم بـەو نامەیـەو بیرەوەریـەکانی خۆیشی لـە کۆنەســتیدا بـۆ ڕوون ببێتــەوە. ئــەو حــەزی دەکــرد بەســەرهاتە سەرســوڕهێنەرەکەی هــەموو شــارەکەی بزانـێ، ئینجـا لـەوە تێبگـات ئـەو کێیـەو لـەم کارەسـاتە گەورەیــەدا دەکەوێتــە کــام لاپــەڕەی ئــەم مــێژووە غەمگینـەوە، چونکـە هـەر سـەرەتا لـە نـاو هۆڵەکـەو لـە دەرەوەی هۆڵەکەشــدا لــە زۆر کەســی بیـستبوو کــە کارەســاتی ئــەم تــەنها ڕوداوێکــە لــەناو هــەزاران ڕووداوی تـری کارەسـاتەکەدا ویـستبویان ڕووداوی ئـــەم ببەســـتنەوە بـــە نهێنییـــە شـــاراوەکانی کارەساتەکەوەو وەک فیلمێکی تراژیدی کۆتاییـەکی بۆ دروسـت بکـەن و لەگـەڵ هـەموو نهێنییـە شـاراوەکانی

تری ئەم شارەدا بمێنێتەوە. عەلی لێوەکانی دەجولاً. چاوەکانی زەق لە شوێنێکی دیاری کراو چەسپیبوون. ئاگاداربووەوە. چاوی بەهەر چوار لای خۆیدا دەگێڕا. چاوەکانی چوونەوە سەر هەمان خاڵی دیاری کراو کە قژەپەرتو بڵاوەکەی کچە بالاًبەرزە کراس گوڵگوڵییەکە بوو، کەڕەنگی هەرگوڵێکی کراسەکەی نەدەچووەوە سەر گوڵێکیتر.

کەمێک شڵەژا هەستی بەفیرۆدانی کات دەکرد، تەنانەت چاوەڕوانی دادوەری تیمە پزیشکییەکە بێزاری کردبوو، شانەکانی هەڵدەتەکان وەک ئەوەی لە خەوێکی قوڵ ئاگادار کرابێتەوە، ئیتر یەک بە یەک ئامادەبوان چیرۆکی کورتو درێژی خۆیان دەگێڕایەوە، بە جۆرێک هەرچیرۆکێک نەدەچووەوە سەر کارەساتی چیرۆکی یەکێکی تر. ئەگەرچی هەندێک جار چیرۆکەکان سنووری خەیاڵیان دەبەزاندو دانیشتووانی ناو هۆڵەکە هەستیان بەڕاستو دروستی رووداوەکان دەکردو بڕوایان پێی دەکرد. لە ناو چیرۆکەکاندا چیرۆکی وەهای تێدابوو کە تراژیدیاو کۆمیدیای وەک پیاڵەیەکی تێکەڵ لەشیرو ئاو وەهابوو، تەنانەت کەس گوێی لە هەناسەی کەس نەبوو، خەڵکەکە هێندە لە ناو چیرۆکەکاندا توابوونەوە

دەتگوت دارو بەردی هۆڵەکەش گوێدەگرن کە هیچ ناڵێن. تا هەموو ئامادەبوان چیرۆکی خۆیان گێڕایەوە، تەنها کچە بالآبەرزە قژ درێژەکە نەبێت، ئەو بە تەنها بە چاو دەدواو بەهەست بەشداریی گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی دەکرد، تەنانەت کە سەرەی گێڕانەوە هاتە سەر ئەو هیچی پێنەگوترا. چاوەکانی وەک کانیە بەهارە بەجۆرێک تەقی بوون هەرگیز بڕوات نەدەکرد جارێکی تر ئەم ڕێڕەوی تنۆکە فرمێسکانە وشکاییان دابێت.

دادوەر سەرسام بوو بە گێڕانەوەی چیرۆکەکان، بۆیە ئەو و تیمە پزیشکییەکە. بەدەستەسرە کاغەزییەکانیان چاوەکانی خۆیان لە فرمێسک پاک کردەوەو هەوڵیان دەدا کۆنترۆڵی هەستی خۆیان بکەنو نەگرین.

تەنانەت یەکێک لە ئامادەبووانی ناو هۆڵەکە بە توڕەییەکی بێزار کەرەوە وتی: جەنابی دادوەر ئەمە چیرۆکی ئێمەیە، کەچی لە دوای ئەو هەموو ساڵەش هێشتا شارەکەمان دەڵێی ڕۆژانی دوای بۆردومانەکەیەو جارێکیتر ئامادەدەکرێت بۆ ژەهربارانکردن. لە ناو هۆڵەکەدا چەند دەنگێکیی جیاواز وەڵامی ئەویان دایەوەو دەیانگوت: لە دوای

مەرگی کەسوکارەکانمان ئاوەدانکردنەوەمان بۆچییە؟ دەیانگوت: ئێمەش مردووین تەنها بۆ ئەوە حەز دەکەین بژین کە ئەو چەند ساڵەی لە ژیاندا ماوین بیر لە بیرەوەری ئەوان بکەینەوە. دەشیانگووت پێش ئەوەی کوچەو گەڕەکو ڕۆحی ئێمە ئاوەدان بکەنەوە. دەمانەوێت پاکانەی هەموو ئەوانەمان گوێ لێ بێت کە لەناوەڕاستی جەنگەکەو لەکەناری جەنگەکەدا تفەنگ لە شان بوون. جا چ ئەوانەی دوژمنن یاخود دۆست. چونکە برینەکانمان بۆنی بارووت و بۆنی پێکەنینە ژەهراوییەکانی دۆست و دوژمنی لێوە دێت. دەیانگوت: سیاسەت پیاوێکی قسەخۆشی درۆزنە دەبا تەنها ئەوانەی پێشبڕکێیان لەگەڵ ژەهرەباکاندا دەکرد کارەساتەکە بگێڕنەوە. چونکە ئەوان دەزانن هەردوو کەڵەگای شەڕ گرەویان لەسەرچی دەکرد، بۆ ئەم شارەیان بۆ شەڕە قۆچی جەنگ هەڵبژارد؟ دەنگە دەنگو ناڕەزایی لە هۆڵەکەدا دەستی پێکرد. هەر لەوێشدا وەکو پشکۆی ژێر خۆڵەمێش ناڕەزاییەکە لە هەموو لایەکی هۆڵەکەوە هەڵگیرسا. عەلی هەربێدەنگو خامۆش دەیڕوانی، بەڕادەیەک عەلی کەوتە بیرکردنەوەی ئەو ساتانەی لە ژوورێکی تاکو تەنیادا لە شاری ئەسفەهان دەژیا. خەیاڵی چووەوە

سەر ئەو وێنە لە چوارچێوە گیراوەی سەر چرپا ئاسنینەکەی ژوورەکەی خۆی. لە نێوان تورەیی‌و هێمنیدا ئەو هەمیشە جولانەی بە خەیاڵی خۆی دەکرد، بەڵام لێرە لەناو ئەم هەموو کارەساتە گەورەیەدا بە گوێی خۆی گوێی لێبوو خۆی بە خۆی دەگوت: عەلی تۆ دەتەوێت ئەنجامی کارەساتەکان بەو شێوەیە بێت کە خۆت دەتەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا ڕۆژگار بەو ئاراستەیەدا دەیبات کە خۆی دەخوازێت.
دادوەر بەفرسەتی زانی، دەیویست ناو هۆڵەکە کۆنترۆڵ بکات. بەدەنگێکی بەرز گوتی تکایە بێدەنگ بن با تیمەکە خەریکی کاری خۆیان بن، یەک لەدوای یەک ئامادەبوان دەهاتن‌و خوێنی خۆیان دەبەخشی بە تیمەکەو هەمووشیان سەرزەنشتی تیمەکەیان دەکرد کە بۆچی زۆرترین خوێن لە جەستەیان دەرناهێنن تا هەرچی زووتر دڵنیابن لە ڕێژەی تەواوی خوێنەکەیان‌و لە خێرایی ئەنجامەکان. ئەگەرچی دەشیان زانی بەکەمترین خوێن کارەکە ئەنجام دەدرێت، بەڵام نیگەرانی ئەوان و کارەزانستییەکە دوو شتی لەیەک جیاوازبوون. دوایین کەس کچە قژ درێژە باڵا بەرزەکە بوو کە لە دوای هەموو ئامادەبووانەوە بە ویقارەوە وەستابوو، بەقژە داهێنراوەکەی‌و میکیاژە

تەنکەکەیەوە دیاربوو جیاوازییەک هەیە لە نێوان ئەمو هەموو ئامادەبووانداا، وەکو ئەوەی بۆ تاقیکردنەوەی بەختی خۆی هاتبێ، جارێکی تر عەلی کەوتە خەیاڵێکی شیرینەوە کە بە توێژاڵێکی تاڵ سواخ درابوو لە موستیلە بریسکەدارەکەی‌و پەنجەی ئەوی دەڕوانی کە بە جوانیەکی سحریی دەدرەوشایەوە. جۆرە نیگەرانییەک لە ناخی عەلیدا سەریهەڵدایەوە ئەویش لەوەوە هاتبوو کە؛ دایکە هاجەری پۆلێنکردنی مرۆڤی بە زۆر چەشن بۆ باس کردبوو، توانیبووی بڕوا بە عەلیش بهێنێت مرۆڤەکان چاک‌وخراپن، ڕەسەن‌و ناڕەسەنن، نزیک لە خواو دوریش هەن. ئەم دوودڵییە عەلی هەراسان کردبوو، بەڵام لەگەڵ گۆڕینەوەی نیگاکان وایان دەرخست هەردوکیان پەلەیانە ئەنجامی پشکنینی تاقیگەییەکە بزانن. گەرچی عەلی لەو کاتەدا هیچ بڕوای بە پێشکەوتن‌و زانستی سەردەم نەمابوو. بیری لەو گوزارشتە دەکردەوە کە دایکە هاجەری گووتبوی: کوڕم عەلی چۆن دەکرێت شارێک بە خەڵک و هەموو و پەلەوەرو زیندەوەرەکانیەوە بکرێت بە تاقیگە؟ چۆن دەکرێ چۆن؟ . ئەو بیری هەر لەلای ئەو چیرۆکە بوو کە دایکە هاجەری بۆیگێڕابۆوە کە باسی قەبارەی فیڵی مرۆڤەکان لە دەریا و ئاسمان و

زەویـدا چەنـد گـەورەن. تەنانـەت فیڵـی مـرۆڤ لـە گیانلەبـەرە بچووکـەکانی ژێـر دەسـتی خۆشـی دایکـە هاجـەری دەیگـوت:پەلـەوەرەکانی سـارا جۆریـان هەیـە وەک کـەو، تـاووس، کۆتـرو قـەل، هـەزاران جـۆری جیـاواز هەریەکـەیان بـە ئارەزوویـەک ژیـان بەسـەر دەبات، تەنانەت هەندێکیان دەریا بەختەوەریان دەکات، هەندێک زەوی. هەندێکیان تـەنها لـە بـەرزایی ئاسماندا هەسـت بـە دڵنیـایی دەکـەن، هەنـدێک ڕۆژ دڵیاندەداتـەوەو هەنـدێکیان تـاریکی شـەو تـا قەترانـی تربێـت پـتر جێگـای دڵنیاییـە بۆیـان. ئـەو دەیگـوت: لـە نێـوان ئـەم هـەموو ئارەزووانـەدا مـەلێکی سارانـشین هەیە. هەمیشە دڵی لای ئەو ئافاتانەیە کە بێچووەکانـی دەخـاتە مەترسـییەوە. دڵـی لای ئـەو بێچـووە زەرنەقوتانەیە کە هێشتا ساوانو ناتوانن بفڕن. بۆیـە سارانشینەکان دێنو بە ڕەنگی زەردی تۆخ ڕەنگینیـان دەکـەن تـا بێچوەکـان لـە هێلانەکانیانـدا وەک گوڵـە زەردە پاییزیـەکان دەربکـەونو دایکـەکانیان وابزانـن توشی ئافاتی زەردوویی هـاتوونو ئیتر پەلەوەرەکـان وەکـو ئـاگر دابگیرسێن، ئـەو مەلـە نیگەرانانـە بەسـەر دەیان شار و کێو و ڕوباردا هەڵدەفڕنو تا بـەردی بـە نرخی سەرەندیبی پەیدا بکـەنو بـە بینیی ئـەو بـەردانە

زەردووییەکانیان بپەڕێ و بێچووەکان لە مردن قووتار ببن. هەر ئەوەندەو ئیتر بازرگانە سارانشینەکان بەردەکانیان دەرفێنن‌و لە بازاڕەکاندا بە نرخی زێڕی دەست‌و قاچی پەیکەری ناو جامخانەکان دەیانفرۆشن، وەکو چۆن کارگە گەورەکان سەرقاڵی ئەو ژەهرەبایەن بە ناوی جوانییەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی جوانی‌و لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانیدا نوێنەرەکانیشیان بە قات و بۆینباخ و گیرفانی پڕ لە گوڵی ئاشتییەوە بە توندی چەپڵە بۆ یەکسانی مرۆڤ‌و چەسپاندنی ئاشتی جیهانی لێ دەدەن.

***

عەلی حەزی نەدەکرد بۆ یەک چرکە خەیاڵی لەسەر ئەو بپچڕێت، لەدڵی خۆیدا دەیان ناوی لەو کچە نابوو کە بە باڵایەکی بەرز و قژێکی قەترانیی درێژ و کراسێکی گوڵ گوڵییەوە ئامادە بوو.

لە ناونانی ئەمیشدا هەستی بە نیگەرانیی دەکردو دەیگوت رەنگە ناوی ئەم کچە وەک ناوی گوڵە پاییزە، یان شەوی یەڵدا، یان غەریبە، یان هەرناوێک کە ئەندێشەیەکی قوڵ پاڵپشتی لێبکات وابێت، بەڵام بۆ خۆی ناوێکی قوربانیدەری پێخۆش بوو حەزی بە توانەوە و سووتانو سۆز دەکرد. لە ناو هەموو ناوەکاندا بەشوێن چیرۆکێکدا دەگەڕا کە واتایەک دەدەن بەئەو. جا حەقیقەت بێت یان ئەفسانە گرنگ نیە، تەنها ناوێک بێت هەمیشە لەدڵی خەڵکیدا زیندوو بمێنێتەوە. دەیگووت: من لە دایکە هاجەرم بیستوە ئاریەکان گۆرانی بۆ شیرینەکانی خۆیان

دەڵێن‌و سامییەکان بۆ لەیلاکانی خۆیان گرنگ ئەوەیە فەرهادێک چیرۆک بۆ کێوی بێستون و قەیسێک بەسەرهات بۆ بیابان ڕێکبخات تامێژوو ناوێکی زیندووتر بۆ خۆی تۆمار بکات.

عەلی خەریکی شەن و کەوی خەیاڵە دوورەکەی بوو، دکتۆرەکەش جانتا تایبەتییەکەی پڕکردبوو، خەریکی پێچانەوەی بوو تابڕوات و هۆڵەکە جێبهێڵێت.

یەکە یەکە خێزانەکان لە هۆڵەکە دەهاتنە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەی بەماچ ناوچەوان‌و ڕومەتی عەلیان سوور کردبووە تالە گەڵیاندابێتەوە بۆ ماڵەوە، سکالایان لە بێ ئەوی دەکرد. هانایان بۆ دەبرد تەنها چایەکیان لەگەڵدا بخواتەوە، پیاسەیەکیان لەگەڵدا بکات. دەگریان دەیانگوت: ئاگات لەخۆت بێت وریابە هیچت بەسەر نەیەت. پارەیان دەدایە ئەو وەرینەدەگرت. مەدالیاو دیاریان دەدایە ئەو سوپاسی دەکردن. هۆڵەکە خەریک بوو بە جارێک چۆڵبێت تەنها عەلی‌و تارمایی کچە بالابەرزە قژدرێژەکە نەبێ پێکەوە هەر سەیری یەکتریان دەکردو دەگریان. بەخەیاڵ دەستیان دەخستە ناودەستی یەکترو لە یەکتر دوور دەکەوتنەوە. سەریان دەخستە سەرشانی یەکترو لێک جیادەبوونەوە، دەستیان بەسەرو قژ و

کاکۆڵی یەکتردا دەهێناو دەستیان دەکشاندە دواوەو هەنگاویان بەرەو لای یەکتر هەڵدەهێنایەوەو بە ڕاستیش هەر لە جێی خۆیان دەمانەوە. یەک بست لە یەکتر نزیک نەدەکەوتنەوە هەستی هەردووکیان لە پێڵوی دوو چاوی ئەویتریان نزیکتربوو. ئیتر ڕوناکی هۆڵەکە کوژایەوەو عەلی بە تەنها لە ناو تاریکی هۆڵەکەدا هاتە دەرەوە، بێ ئەوەی لە هۆڵەکەدا کەسی لە دوای خۆی جێهێشتبێت.

***

تەنهـــا دوو ڕۆژ بەســـەر ئەنجامـــدانی خوێـــن وەرگـــرتنەکەدا تێپەڕیبـوو، هۆڵەکـە سـیخناخ بـوو لـە هـــەموو ئەوانـــەی دانیـــشتنی پێـــشتر ئامـــادە ببـــون و هەنـدێ میوانـی تـریش هـاتبون تـابزانن سـەرئەنجامی چیرۆکی عەلی بەکوێ دەگا.

عـەلی لـە نێـوان ئـاپۆرەی خەڵکەکـەدا وەسـتابوو، ئـەوان دەسـتیان بەسـەر سـەر و شـانو ملیـدا دەهێنـا، وەک ئـــەوەی خۆیـــان دڵنیاکەنـــەوە کـــە هێـــشتا عەلـــی زیندووەو ناگەڕێتەوە بۆ سەر گۆڕی دایکە هاجـەر و شاری دڵنشینی ئەسفەهان.

لە ناو ئاپۆرەکەدا یـەکێک دەیگوت: دەنگی عەلـی دەچێتەوە سەر دەنگی خێزانەکەمان. یەکێکی تـر هەڵـی دەدایەو دەیگوت: عـەلی چـاو و برۆکـانی ڕێـک لـە بـرا جوانـە مەرگەکـەی مـن دەچێـت، کـە پێـش چـوار پێـنج ساڵ لە شـەڕی داگیرکەراندا شـەهیدبوو. هـەر یەکـە بـە

جۆرێک وێنەی عەلیان لە دڵی خۆیدا نەخشاندبوو. پەیکەری عەلیان لەسەر ترۆپکی بیرەوەری خۆیان هەڵکەندبوو.

ئامادەبوان ئاپورەیان دابوو لە باڵای حەپەساوی عەلی. . دادوەر بڵاوەی پێکردن عەلیش لە بەردەم دادوەردا نوشتایەوە، وەک ئەوەی سوپاسگوزاری ئەم ماندووبوونـــــەی لێبکـــــات. دادوەر چووەســـــەر کورسیەکەی خۆی‌و هیچی نەگوت. عەلی بەخەیاڵی دوێنێ ئێوارەیەوە سەرگەرم بوو، هەر بە چاو بە شوێن تارمایی کچە باڵابەرزە قژدرێژەکەدا دەگەڕا، نەیبینیەوە! عەلی عارەقەی ماندووبوونێکی بێشوماری دەردەدا. شڵەژابوو وەک شڵەژانی بێچوە پشیلەیەک لە بەردەم بەردبارانی چەند منداڵێکی چەتوندا.

ویستی لە یەکێک لە ئامادەبووان یان پاسەوانی بەردەرگای هۆڵەکە بپرسێت کە ئەو چی لێهاتو بۆ نەهات! ئایا دێت! ئەی کە دێت کەی دەگات! بەڵام هەرزوو لە کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە پەشیمان بووەوە، کە ڕەنگە هێشتا زووبێ بۆ کردنەوەی. عەلی هەر دەیڕوانی لە ناکاو بینییەوە، وەلێ سەرسام بوو بە بینینەوەی. ئەو هاتبوو، بەڵام قژە درێژەکەی لە پشتەوە بە جۆرێکی ئەفسوناوی گرێدابوو، کراسێکی

خۆڵەمێشی لەبەر کردبوو، چەفتەیەکی قەترانیی دابوو بە سەر ملیداو بە شانەکانیدا هاتبووە خوارەوە، هەروەکو عەلی چۆن پێشتر مشکییەکی خۆڵەمێشی کە چوار دەوری بە خەتی سوور ڕایەڵە کرابوو کردبوویە ملیو لەسوچێکی نیمچە تاریکدا دانیشتبوو، جاروبار لە جێی خۆی هەڵدەستاو پاڵی دەنا بە دیوارە ڕەنگ زەردەکەوە، لەو دەمەدا عەلی وای هەستدەکرد کە تابلۆیەکی غەمگینە و چاوەڕێی چارەنووسی خۆی دەکات. ئەو هونەرمەندەی دروستی کردوە بیری چۆتەوە ناوی خۆی لە ژێر ئەو تابلۆیەدا بنوسێت.

عەلی خورپەیەک ئاگاداری کردەوە، تۆ بڵێی هەواڵێک ئاگاداری کردبێتەوە کە نزیکیی منو ئەو وەک نزیکیی دوو خونچەی گوڵە باخێک وابێت کە وەیشومەیەک لە یەکتری دابڕاندبێتن؟ زۆر ترسا دڵی کەوتە پەلەپەل. ئامادەبووانی هۆڵەکە هەستیان بە تێکچوونی باری دەروونی عەلی کرد گوێیان لە ترپەی دڵی بوو. کتوپڕ نائارامیەک کەوتە هۆڵەکەوە.

عەلی سەری داخستبوو، سەیری مۆبایلەکەی دەستی دەکرد بە وردی لێیدەڕوانی شاشەی مۆبایلەکەی وێنەی خۆیو دایکە هاجەری لەسەربوو. وێنەیەک جیاواز لە هەموو وێنەکانی تر. وێنەی دایکە

هاجەر لە ناوباخێکی هەناردا، عەلی سەری خستبووە سەر ڕانی چەپی ئەو.

وێنەکە هێندە سەرنج ڕاکێش بوو عەلی نەیدەتوانی سەر بڵندبکاتەوە، نەیدەویست دایکە هاجەری جێبهێڵێت. لەو دەمەدا پڕ بەدڵ حەزی دەکرد باڵ بگریۆ بچێتە سەرگۆڕی دایکە هاجەری. بە دیقەت جارێکی ترو سەد جاری تر ئەو شیعرە عیرفانیانە بخوێنێتەوە کە باس لەبێهودەیی ژیان دەکەنو لەسەر کێلەکەی نوسرابوون، کە شیعرە عیرفانیەکانی خیام و حافیزی شیرازیو حیکمەتەکانی ئیمامی عەلی بوون.

ئەو حەزی دەکرد دووباڵی لێ پەیدابێتو بچێتە قەراغ شاری ئەسفەهان، پڕ بەدڵ بگری بۆ دووری دایکە هاجەریو چارەنوسی نادیاری خۆی، بەڵام نەدەکرا. . ! خەیاڵی عەلی هێندە لە وێنەکەدا ڕۆچوو بوو هەموو ئامادەبوانی هۆڵەکە کەوتنە خەیاڵی ئاگادارکردنەوەی ئەو. دادوەرەکە ویستی دۆخەکە هێمن بکاتەوە، چاوی بە هۆڵەکەدا گێڕا وەڵامی پیاوێکی کەڵەگەتی تەمەن سەرو شەست ساڵانی دەدایەوە، پیاوەکە داوای دەکردو سووربوو لە سەر ئەوەی دەردە دڵ لەگەڵ ئامادەبواندا بکات. دادوەر

ڕێگای پێدا. پیاوەکە جەستەیەکی بە هێزو بە چاوێکی جوتیارانــە دەیڕوانــی. وەک ئــەو پەلــەوەرە کێوییــەی هەمیشە بـە هـەر چـوارلادا دەڕوانـیٚ تـا لـە مەترسـی دڕندەو مرۆڤە ڕاوچییەکان دڵنیا بێت.

ئەو هیچی وای دەربارەی عـەلی نـەوت ئەوەندە نەبێت وتی: من لە هـەمووتان زیاتر حەزدەکـەم عەلی کوری من بێت کە ڕەنگە واش نەبێت واش دەرنەچێت. ئەگــەرچی منیــش وەک ئێــوە چــاوەڕوانی ئەنجامــی تاقیگاکانم، بەڵام دڵم خەبەری پێداوم ئەو بەشێک بێت لە جەرگم. تا کاتی دەرچوونی تاقیگاکان من هیچم نیە بیڵێم ئەوەنـدە نـەبێت؛ دڵنیـام لەهـەر شـوێنێکدا جەنـگ هــــەبوبێت خــــەڵکی ئــــەویٚ چــــاوەڕوانی ئەنجامــــی تاقیگاکانن چاوەڕوانی بەسەرهاتی عەلیەکانی خۆیانن ئــەو دەیگــوت: ونبوونــی عــەلی تــەنها لــە شــاخەکانی شــنرویٚو لاپاڵــەکانی عەبابــەیلیٚو چیــا بەرزەکانــی باڵامبۆدا نین. ڕەنگە دەیان عەلی هەبن لەویٚ لە شـارە دوورو نزیکـەکانی دونیـادا ئێـستا بەشـوێن دایـک و بـاوکو بـراو خوشـکەکانیدا بگـەڕێن. کـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دایکێکــی برســی هــەر بــە مەلۆتکــەیی لــە ڕاستەڕێی شـەقامێکدا جێی هێشتوون. دەزانـم گـەڕان بەشـوێن ونبویەکـدا گـەلیٚ ئەسـتەمترە لـە مـردن. مـن

جوتیارم بە بازووی خۆم شاخم هێناوەتە سەر چۆک. جۆگە پیاسەی تێدابکاتو بەردم ناچارکردووە بشکێ تاسنگی بکەم بە پلوسک بۆ چەند درەختێکی گەڵا سەوز. ئەگەر ئەمە تاوانێک بێت بەرامبەر بە سروشت کردوومە داوای لێبوردن لە ئێوە و ئاسمان و سروشت دەکەم. من تەنها بۆ ژیان سروشتم ئازارداوە. تا مرۆڤ هەست بە بەردەوامی ژیان بکات. من ئەگەر گوناهباریش بم گوناهبارێکی ناشرین نیم تاشایەنی دزینی منداڵەکانم و گەڕان بەشوێن پارچەیەک لە جەرگمدا بم.

پێچەوانەی خاوەن کارگە بەرهەمهێنەرەکانی مەرگ، ئەوکارگانەی خەریکی دروستکردنی ڕابوردوییەکن لە خراپەی جەنگە وردو درشتەکان. تەنانەت ئەو جەنگانەی سەربەستی نیشتیمانو یەکسانی مرۆڤ و هەموو شتە جوانەکانیش دەکەن بە بەهانە بۆ خۆیان. ئەو جەنگانەی فەرماندەو سەرکردەی جەنگە سپی و ڕەش و هەمەرەنگەکان کە باخچەکانیان بەپاشماوەی پارچە ئێسکی جەنگاوەری جەنگە گەورەو بچووکەکان تەنراوە. ئەو باخچانەی سەرچاوەی ئاوەکەیان کاریزی ئازارو کانیو جۆگەلەی خوێنی خەڵکییە. ئەوان ئازاری سروشت

دەدەن، تا عەلیەکانمان لێ وون بکەن. ئێمەش تاماوین بەشــوێنیاندا بگەڕێیــن یــان بەدیــار بیرەوەریــی و تارماییەکانیــانەوە کــۆتەڵ بگــێڕین. لەباخچەکانیانــدا درەختیــان لــەزێڕو وزیــو گرتــوە تادرەختــەکانیان لــە ڕەنگی درەختی خەڵکو خوا نـەچێت، ئەوان سروشـت وەک باخچــەی ئــاژەڵان دەبینـن، کـە مرۆڤـی دڕنـدەو مـەلو مـور و هـەموو گیانلەبـەرەکانی تێدا دەژیـن. لـە باخچـە زێڕینییەکانیانـدا، هـانی کەڵەشـێرو نـێرە قـەلو گەمــاڵ و کەڵــە کێویــەکان دەدەن یەکــدی بخــۆن، پەلاماری یـەکتر بدەن تـا شـەکەتو ماندوو خوێناوی دەمانهێننــە پێکــەنین. باخچــەکانیان پــڕە لــە مەلــی سەرسـوڕهێنەر تـا نەخۆشـیەکانیان وەک جنۆکـە لـە لاشـەیان بهێننـە دەرەوە. باخـەکانیان پـڕە لـە تاوسـی ڕەنگـاو ڕەنـگ تـا هـەرکاتێ ئـارەزوو بکـەن لـە لـە نجــەولاری ژنێکــی جوانــتر بــڕوانن لــە ژنــە لەبەرچاوکەوتووەکانی خۆیان.

به وەڕینی سەگی بەر قاپیەکانیان دڵخۆش دەبن، تــا هەمیــشە گوێیــان بە وەڕیــن بــزرنگێتەوە کــاتێ سەگەکان هەست بە برسێتی دەکەن. بە کلکی درێژی مـایینو ئەسـپە دەگمـەن و نایابـەکانیان سەرسـامن، کـاتێ بـەجیا کلکە لـەقێیان بۆ دەکـەن. ئەوانـە ڕۆژانـی

ڕابردووی خۆیان دێتەوەپێش چاو تاکو بە ئایندەی خۆیان دڵخۆشبن.

باخچەکانیان پڕە لە مامزو کاریلەی ڕەنگاو ڕەنگ، هەتا دیمەنی کچە نەباڵقەکانیان لە پێش چاوبێت ئەو کچانەی کە چارەنوسی برسێتی ملیان پێ کەچدەکات بۆ لەزەت. قاقا بەو پەندە پێدەکەنن، کە دەڵێ "خۆشەویستم، هەموو ئەندامەکانی جەستەم بۆلەزەت بەکاردێنم تەنیا لێوەکانم نەبێ بۆ خۆشەویستی تۆ" ئەمە دەسکەوتی هەموو جەنگە گەورەو بچووک و ڕەش و سپی و هەمە رەنگەکانە. دادوەر حەپەسابوو کە چۆن جوتیارێکی سادە ئەم هەموو ئەندێشە قوڵانەی هەیە، بەتایبەتی دواین دێڕی قسەکانی دادوەرەکەی سەرسام کردبوو کە وتبوی کرمی برسێتی هێواش هێواش چواردەوری مرۆڤ دەتەنێ، تامل کەچ بکات وەک مل کەچکردنی کەرتە شاخێک بۆ سروشت تا بەیەکجاری هاڕە دەکاو وردوخاش دەبێت. دادوەرەکە قوڵ لەجوتیارەی دەروانی. سەرسام بوو بە هونەری فێربوون‌و سوود وەرگرتنی لەژیان. لەبەر خۆیەوە گوتی: ژیان قوتابخانەیەکی گەورەیە مرۆڤ، هەموو تەمەنی بەشی ئەوە ناکات لەقۆناغی قوتابێتی تێبپەڕێت. بۆیە ویستی

بەشـداریيەکی هونەریانـە بکـاتو لەسـەرخۆ ئەوپەڕی توانـای ڕۆشـنبیریی خـۆی بۆجووتیـار وئامـادەبوان ئاشکرابکات. لەسەرخۆ گوتی:باشە مادام کار گەیشتە گێڕانـەوەی چیرۆکـی ئـەو مەرگـە ساتانەی مـردن لـە ئاسـتیاندا لاڵـە و کورتەبنەیـە بابپرسـین؛ ئـەی ئـەو ژنانـەی مێردەکانیـان خـۆش ناوێـت شـەوانیش تاکـو بەیانی لەگەڵیاندا دەست لـە ملانن بە بەراورد لەگەڵ ئەو ژنانەی بەنەفرەتکراوی هەمووانن. گوایە ئەوان لـە بازاڕی فرۆشتنی جەستەدان و ئەمانیش بەتەنها هەر هی مێردەکانیانن. بەڕاستی جیاوازیەکانیان چییە. ها. . بەڕاسـتی جیاوازیـەکانیان دەزانـن؟ دادوەر بـێ دەنـگ بـوو چاویلکەکـەی لـە چـاوی کـردەوەو قەڵەمەکـەی بـەخێرایی خـستە سـەر کاغـەزەکانی بەردەسـتی، هەسـتی کـرد پیـاوانە دەدوێ وەک هەمـوو پیاوێکـی گرێدراو تەنها بە پەیمانێکی فەرمـی سـەر کاغەزەوەو هـەرچی ئـەوەی لەمـێژە لەناخیـدا پـەنگی خـواردبێتەوە دای ڕشـتبێتە سـەرزەوی. عـەلی شـەرمنانە سـەرنجی لەسـەر کچـە قژدرێـژە بـاڵا بەرزەکـە چـەقیبوو. کچـە تێگەیـشت وەک تێگەیـشتنی پۆلـە کۆترێکـی مـاڵیی لە ڕۆکردنی مشتێ گەنم.

***

هێشتا تیمە پزیشکییەکە نەگەیشتبوونە هۆڵەکە، دادوەر ئاگاداری ئامادەبووانی کردەوە کە؛ ئەنجامی تاقیگەکان ڕەنگە کەمێ دوابکەوێت لەبەر سەختی کارەکەو بۆ دڵنیایی تەواوی تیمە پزیشکییەکە لە ئەنجامی کارەکەیان. عەلی زیاتر هەستی بە بێزاری دەکرد، بە تایبەت زۆر چیرۆکی تراژیدی لە هۆڵەکەدا دەگێڕدرایەوە، تەنانەت مرۆڤ بەرگەی گوێ گرتنیشی نەدەگرت، بەتایبەتی منالآن و ژنە سک پڕ و بەساڵا چووەکان. بۆ نموونە یەکێ لەئامادەبوان لە نێوان دوو کچدا دانیشتبوو کە هەردووکیان ڕووخساریان جێ برینی ژەهربارانیان پێوە دیاربوو. دەستەکانیان بە ژەهرەباکە سوتابوو، وەک دوو مرۆڤی کەمئەندام هەڵدەستانو دادەنیشتنەوەو جێیان بەخۆیان نەدەگرت. پێش ئەوەی باوکیان دەست بکات بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی داوای لێبوردنی لە ئامادەبوان

کــرد، لەبــەر خــیزە خــیزی ســنگی هــەردوو کچــە عازەبەکـەی کـەمێ بڵنـدتر قسـە دەکـات تـا بەئاسـانی ئەوانــەی لــە دەوروبــەرن تێبگــەن کــە لــە کاتــی ژەهربـارانکردنی شـارەکەیاندا بـەو چەکـە کوشـندەیە پێکــراون‌و ڕۆژ بــە ڕۆژ گــوزەران و تەندروســتیان بەرەو خراپتر دەچێت، ئامادەبووەکە ڕویکردە عەلی وەک ئەوەی کارەساتەکەی بیر بهێنێتەوە کە دەمێکە لە لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بە مانشێتی گەورە گەورە دەنوسرێت تا تیراژی ئەو بڵاوکراوانە زۆرتر ببن و خەڵک لە جاران زیاتر بیانکڕێ تەنانەت ئەو هەموو تیم‌و ڕێکخراوە ناوچەیی‌و جیهانییە کە تەنها کۆنگرە و کۆنفراس و سیمینار لەبارەی ئەو چەکە کۆکوژانەوە دەگرن. هەر دوای تەواوبوونیان لەبەر دەرگـای دەرەوەی هۆڵـەکان پەشـیمان دەبنـەوە لـە بڕیارەکانیان و یادداشتە بەنرخەکانی خۆیان دەخەنە تەنەکە خۆڵەکانەوە. پیاوەکە ئەو ڕۆژانەی دەهێنایەوە یاد کە ڕۆژی ژەهربارانکردنی شارەکە لە دەیان شیو و دۆڵ‌و جۆگەلــەی جیاجیــاوە ســەرچاوەی زەڵــم فراوانــتر دەبــوو. ئــەو ســەرچاوەیەی کەدەکەوێتــە باکوری ڕۆژئاوای شارەوەو تاکە ڕێگا بوو بەسەر پــردی ڕزگاربوونــدا بگەیتــە ســنووری ئەودیــو

ژەهرەباکە. ئاوەلێڵە هەڵچووەکە تادەهات بەهاژەترو خوڕتر دەینواند ئەو ڕۆژەی ژەهر لەسەرخوانیماڵەکان کرا بە دیاری و دانرا، ئاسمان بە کوڵ دەگریا وەک گریانی ژنێکی غەدر لێکراو. لەجێی باران قوڕاوێکی خەست بە سەرچاوەکەدا دەهاتە خوارەوە. سەدان ماسی گەورەو بچووک کەوتنە سەر ئاو، بەدەیان تارمایی گیانیان دەکرا بە بەرداو پەلاماری خەڵکی تۆقیوی شارە ژەهربارانکراوەکەیان دەدا. سەرچاوەی زەلم کە دەچووە سەر گۆمی قوڵو فراوانی ڕووباری سیروانەوە هێندە لێڵ بوو مەترسیت دەکرد دەریا گەورەکان دزەیان کردبێتە ناوییەوە. هەرکەسێ لەتاو مەرگ بیویستایە لە وێوە دەرباز بێت و سنووری ژەهرەباکە تێبپەڕێنێت بەسەدان ماسی جۆراوجۆر پەلاماری دەست و قاچ و ئەندامی لەشی دەدان و دەیانخواردن. چەندین مناڵی نابالق بەسەر ئاوەکەوە ڕەش دەچوونەوەو پاڵ کەوتبوون چەندین ساوای ناوبێشکە بەسەر شەپۆلەکاندا دەهاتنە خوارەوە. لەزۆر شوێندا خەڵکی پۆل پۆل بەئاشکرا خۆیان دەدا بەدەم ئاوەخوڕ و لێڵەکەی زەلمەوە. ماسییەکان پەلاماری زۆربەیان دەدان و دەیانبردن بۆ ژێر لێلایی ڕووبارە خوڕەکە.

زۆرخـێزان بـەپێی پـەتی و بـێ بـەرگ و تەنانـەت بـە کوێـری رێیـان دەکـرد و دەگریـان زۆر جـاریش هـەر ئەو خێزانە ماندوانە بۆ بارسوکی ڕێگەیان لەناچاریدا هەنـدێ لـەکەل و پەل و منداڵـەکانی خۆیـان لـە گـوێ ڕووبـارە لیڵەکـە جـێ دەهێـشت هـاواری ئەو منـاڵە ساوایانەو هـاژەی ڕووبـارە هەڵچوەکـە تێکـەڵی یـەک دەبـوون کـە هیـچ کـەس نەیدەزانی ئـەو ڕووبارە چـی دەبیستێ و ئەو منداڵە جێ هێڵراوانە چی دەڵێن.

مینــەکانی ســەر ڕێگــای ڕووبــارە لیڵەکــە کــە سەربازە شەڕکەرەکان بۆبەرەی دوژمن دایان نابوون جۆرێکیتر بوون لە دوژمنی مرۆڤ و دۆستی مـەرگ دەسـتو قـاچی زۆرکەسـیان لەبنـدا پەڕانـد . لەنێوانـی چەند هەنگاوێکدا مینێک چێنرابوو ئاسان نەبوو کەسێ بەخت یاری بێ و ئەندامێکی لەشی لەدەست نەدات. لە ئاسمانیــشدا وەک ڕێژنــەی بــارانی پۆلــە فڕۆکــە شەڕکەرەکان دەهاتن، میوانی مەرگ بوون کەس نەما بەسەری نەکەنەوە تەنانەت درەختیش نـەما گـەڵاو لـق و چڵ و چێوی شەهید نەکرابێ.

سنووری نێوان شـاری ژەهـر خـواردو تـا شـارە چاو بە گریانەکانی دەووروبەر، بە ڕەوەجاشی گەورە گــــەورەو ڕیــــزە ســــەربازی جەســــتە بەفیــــشەک

داپۆشرابوو لەودیو تەلی دڕکاویەوە چاوەڕوانی ئێمە بوون. بگەینە لایان و هەر هەموو قۆڵبەستکەن، تا نهێنی ژەهرەباکە دەرنەچێت. تا برینی بەسامی ئەو خەڵکە نەگاتە دڵی هیچ کەسێ و بەسانایی کوژرانی شارێکی زەبەلاح بخرێتە پەراوێزی شەڕی نێوان هەردوو کەڵەگاکەوە. دادوەر دەیوویست شتێ بیری عەلی بێنێتەوە، تادڵنیا بێت کارەساتی عەلی جگە لە پشکنینی تاقیگەیی DNA بە جۆرێکی تر یەکلایی بکاتەوە. بۆیە هەمیشە هەوڵی دەدا هەریەکە چیرۆکی خۆی چۆن ڕویداوە وەکو خۆی بگێڕێتەوە، بەڵکو یەکێ لەو چیرۆکانە شتێ بیر عەلی بێنێتەوە کەیەکانگیر بێت لەگەڵ چیرۆکی عەلیدا.

عەلی لەسەر خۆی هەربۆ خۆی دەدواو دەیگووت؛ کێ نالێ ئەوەی منی گەیاندە بیمارستانی ئەو شارەی چەند فرسەخێ لە ژەهرەباکەوە دوور بوو، منی لە نوای ماڵە جوتیارێ نەدۆزیوەتەوە. ئەی کێ نالێ دوای بەجێمانم لە مردن، دەڵە گورگێک یان گیاندارێک نەیپاراستوم کاتێک گوێی لە گریانم بووەو هەستی بە تەنیاییەکەی من کردوە. زۆر کەس هەر لەوێ پرسیاریان لەعەلی دەکردو دەیانگوت:ئایا تۆ منداڵیی خۆتت بیردێتەوە. دەیان گووت ئایا تۆ

دەزانیت دواین جار دەستت لەدەستی کێدا بوو کە جێی هێشتی. پرسیاری وایان لێ دەکرد ئەو هەستی بەبروسکەی هەڵدانەوەی برینەکانی خۆی دەکرد بەڵام. عەلی سەری دەخستە نێو هەردوو لەپی دەستەکانیەوەو هۆن هۆن دەگریا و دەیگوت: نا، هیچم بیر ناکەوێتەوە جگە لە سۆزی دایکە هاجەرم نەبێت، تەنها ئەوم بیر دێتەوە.

***

عەلی کاتێک سەری لەنێو لەپی دەستەکانیدا دەرهێنا. کچە بالا بەرزە قژدرێژەکە خەریک بوو کۆتایی بە گێڕانەوەی چیرۆکە دوور و درێژەکەی خۆی دەهێنا. عەلی نەیزانی چەندێکە سەری لەناو لەپی دەستەکانیدا شاردبۆوە. بۆیە ئازارێک لە ڕۆحیدا گەورە دەبوو کە نەیتوانی چیرۆکی ئەو کچە بالا بەرزە قژدرێژەی بەتەواوی گوێی لێبێت. کاتێک لە کۆتایی قسەکانیدا وتبووی من لە سیانزە ماڵەی هەڵەبجەم، ئەو سیانزە ماڵەی لانکەی سەربەستی ژنان و سەرچاوەی فەرهەنگی دامەزراندنی یەکەم قوتابخانەو یەکەم باخچەی پڕ لەهەنارو سێو دەناسرێنەوە. کاتێک کچە بالا بەرزە قژ درێژەکە ناوی سێوی هێنا، هەموو دانیشتوانی هۆڵەکە هێڵنجیان دەهات، خەریک بوو دەرشانەوە. کچەکە دەیووت وەک دەڵێن؛ کاتێک دایکم ژەهرخنکێن کرا من

تەمەنم چەند مانگێک بووە، لەناو باخچە هەنارەکانی (سازاندا) دایکم مردو من دەمم هەر بە مەمکەکانیەوە جێمابوو. بە مردوویش تامی شیری دایکایەتیم دەکرد هەر ئەوەندەشیان بۆ گێڕاومەتەوەو هیچیتر. دەیگوت: دوای هانامان بۆ ئەو دیو سنووری ژەهرەبا دەیان پەرستاری خوێن شیرین دەیان پزیشکی بلیمەتو لێهاتوو برینەکانی ئێمەیان پاک کردۆتەوەو ڕزگاریان کردووین لە مردن. لەو ساتەوە کەهەستم کردووە دەتوانم پلە بە پلە بە پەیژەی تەمەنمدا سەرکەوم هەموو ڕۆژێک لە گۆڕستانە گەورەکەی ئەم شارەدا یەک بە یەک گۆڕە بە کۆمەڵەکان دەگەڕێم، ناوی هەموو خێزانەکەی خۆم بەسەر کێلە سپییەکانەوە دەخوێنمەوەو، بەڵام ئایا من چۆن دەتوانم دڵنیابم لە مردنێک کە کەس نەیزانیوە شێوە و ڕوخساری شێواوی کەسێکی خۆی لە برینی ژەهرەباکان جیاکاتەوە. کچە باڵا بەرزە قژ درێژەکە قوڵپی گریان تەنگی پێهەڵچنیبوو، لەوە زیاتر هیچی نەوت ئەوەندە نەبێت وەک دەمی بورکانێکی ئاگرین دایەپڕمەی گریان.

***

دادوەر سـەیریێکی کـاتژمێرە هەڵواسـراوەکەی پشت سـەری خـۆی کـرد، کـاتژمێر لـە پێنجـی ئێـوارە لایـدابوو. هەسـتی بـە مانـدووبوون دەکـرد، بـە هێمنـی دەیـڕوانییە هەڵـسوکەوتی ناسروشـتیی عـەلی. ئەو هەسـتی بەوە کردبـوو، بـەخۆی دەگـوت؛ باشـە ئەگـەر ئـەنجامی تاقیگاکـان بمکـات بـە کـوڕی یـەکێ لـەم خێزانانـە. منیـش دایکێکـم هـەبێت بەسـۆزتر لـە دایکـە هاجەرم ئایا دەبێت بەراوردی ئەو هـەموو دڵسۆزیەی دایکـە هاجـەرم لەگـەڵ دایکێکـی تـازە ناسـیودا چـۆن هەسـت پێبکـەم؟ دادوەر هـەر لـە ڕەفتـاری نـاجێگیری عـەلی دەڕوانـی چـونکە دەیزانـی کـاتی هـاتنی تیمـە پزیـشکییەکەو ئـەنجامی تاقیگـەکە هـاتووە. دادوەر بەچەکوشـەکەی دەسـتی هـەموانی ئاگـاداری کـرد. تائامـادەبن، هەرئێـستا ئـەنجامەکەتان بـۆ دەخوێندرێتـەوە. دوایـن وشـەی دادوەر تێکـەڵ

بەخرمەژنــی شــەقەی خــێرای هــەنگاوەکانی تیمــە پزیــشکەکە بــوون بــۆ نــاو هۆڵەکــە. بێدەنگییەکــی سـامهێنەر بەتـەواوی هۆڵەکـەی داگـیر کـرد. دەنگـی ترپەی دڵی ئامادەبوان دەگەیشتە سەرمێزی دادوەرەو تیمـە پزیـشکییەکە. هیـچ کـەس نەیـدەزانی لـەکوێوە دەسـت پێبکـات، بـەچی سـەرەتای شـتەکان دەسـت پێبکــەن. ســەرەتا دادوەر بــەدەنگێکی نــوزەڵ وەک ئەوەی بەزۆر وشـەکانی لـە قوڕگ دەربهێنرێت وتـی: ئامادەبوانی خۆشـەویست، خـەڵکانی چاوەڕوان، ئێستا ئــەنجامی هــەموو خێزانێـک بـەجیا دەخوێنـدرێتەوە. ئەگەرچی عەلی کوڕی هەموومانە، بەڵام ئایا دەبێ بە یــەکێ لــە ئەنــدامانی خێزانــی کــێ؟ دەبــا هــەموو چاوەڕوان بین بزانین چی دەگوزەرێت. دادوەر لـەوە زیـاتری پـێ نـەدەگوترا بۆیـە هـەموو لاپـەڕەکانی دایـە دەست پزیشکەکە تا لە جێی ئەو کارەکان تەواو بکات. لـە ڕاسـتیدا پزیـشکەکەش واقـی وڕمـابوو، نەیدەزانـی چی بڵێ، ناچار یەک یەک خێزانـەکانی بانگ دەکردو داوای لێبووردنـی لێـدەکردن. هەنـدێ خـێزان بـەناوی خۆیانـەوەو هەندێ خێزان بەنازناویانـەوە هەنـدێکیش بـەجۆرێکی تایبـەت بانـگ دەکـران، دوایـن کـەس کـە لەسوچی دادوەری هۆڵەکەدا خۆی مەڵاس دابوو کچـە

باڵا بەرزە قژدرێژە کراس گوڵ گوڵیەکە بوو، ئامادەبوان دەیانووت: عەلی هی ئەوانە، هی ئەو کچە باڵا بەرزە قژدرێژەیە، جگە لەو عەلی هی کەسی تر نیە. کچە باڵا بەرزە قژدرێژەکە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، تف لەناو دەمیدا وشک بوو، تا دەهات چاوەکانی تروسکاییان ڕەش دادەگەڕا. پزیشکەکە بانگی ئەوی کرد، بەڵام ئەو هێزی وەڵامدانەوەی پزیشکەکەی نەبوو بڵێ: بەڵێ، یاخود، نا.

بەزۆر خۆی بە کێشکرد بۆ بەردەمی دادوەرو تیمە پزیشکییەکە. عەلی ورد ورد دەیڕوانی، هەستی بە تەریقبوونەوە کرد. هەموو گیانی نیشتە سەر عارەقێکی سارد فرمێسک لە چاوەکانیدا ڕامان، نەیدەتوانی لە جێی خۆی هەستێت. دەیزانی کارەساتێک بەڕێوەیەو هەر ئێستاکەش ڕودەدات. ویستی شتێک بکات، هەرشتێ! دەستەکانی بۆ بەرز نەدەکرانەوە، قاچەکانی بۆ نەدەجوڵێندارییەوە، وشەکان لەسەر زاری مەیبون. بەسەرسامی دەیڕوانی و هیچیتر. دادوەرو پزیشکەکە سەیری یەکتریان کرد، وەک لەبێهودەیی کارەکەیان بڕوانن، لەئەنجامی کارەکەیان ورد دەبوونەوە. ئەوانیش هەر سەرسامو حەپەساوبوون. دادوەرەکە هیچی نەگوت، ئەو

نەیتوانی هەر هیچ بڵێ، تەنها پزیشکەکە نەبێ کە وتی: خاتوون بەداخەوەم عەلی هیچی تۆش نییە و بەشێک نییە لە خێزانەکەی تۆش وەک ئەوان. کچە قژدرێژە باڵا بەرزەکە گریا، گریانێک بە کوڵ کە تێکەڵ بوو لە بێئومێدیو سەرەتای ئومێدێک کە نەیدەزانی ئەم چیرۆکە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە و بەکوێ دەگات. ئامادەبووان بە چاوی پڕ گریانەوە یەک یەک دەهاتنو دەستیان دەکردە گەردنی عەلیو دەگریان. دەستیان دەدا لە قژو شانیو هەموو جەستەیان ماچ دەکردو دەگریان. عەلی هێشتا هەر حەپەسابوو. هیچی نەدەگووت هیچیشی نەدەکرد، تەنها وەک پەیکەری پیاوێکی پیرۆز دەیڕوانی. خەڵک یەک یەک ماڵ ئاواییان لێدەکرد. کچە باڵا بەرزە قژدرێژەکەش هەروەها!

***

لــەوە بــەدواوە عــەلی لەیــەکێ لــە کۆڵانەکانــی گــەڕەکی کــانی ئاشــقان دەژیــا، ئــەو گەڕەکــەی وەک سـمبولێک وابـوو بـۆ ناسـینەوەی ئـەم شـارە هەمیـشە بریندارو دڵتەڕە. مێژووی ئەم گەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای یاخیبوون لـەو سنورانەی کـەس نەیدەزانـی لەودیویانـەوە چـی دەگـوزەرێ. زۆری ویـست هـەموو ئەو پەیکەری دێوەزمانە بشکێنن کە بەڕۆژ لە خەڵکـی دەهاتنــە دەنــگو پــەلاماری ڕێبــوارو کچــانی تینــوی سەربەستیان دەداو بەری ئەو درەختە باڵا بەرزانەیان دەڕنی کە میوەی جۆراوجۆریان پیادا شـۆڕ ببووەوە. مۆڕەیـان لـەو کەسـانە دەکـرد کـە دەیانویـست شـتێک بڵێـن پێش ئـەوان کە کەسـی تـر نـەیوتوە. بەشـەویش ڕوویــان لــە ئەســتێرەو مانــگ و تریفــە دەکــردو بـەراوردیان دەکـردن بـەو شـتە جوانانـەی تـەنها لـە خەوندا دەبینرێن. تەنها ئەو دەست و پەنجانە دەیزانن

کــه وێنــەیان دەکێــشن لــە زەحمەتــدا زۆر نابــات دەتوێنەوەو لەناو دەچن. کانی عاشقان پەناگەی ئەو کچ و کوڕە بێ پەنایانە بوو کە بەهیچ کلۆجێ ئازادی نەیدەوێرا دوورو نزیک ڕووی تێبکات. لەوێ لەناو باخە هەنارەکانی ئەوێدا سەرەتا کۆترە شینکەکان خەڵکیان فێردەکرد کەچێژ لەخوێندن وەرگرن. فێریان دەکردن بەقوڵی بیر لە فڕین بکەنەوە تاسنووری ئاودیوکردنی خەیاڵ بۆ هەرجێیەک مرۆڤ حەز بکات. لــەوێ یەکــەم تەقــەی داگیرکــەر نــرا بەســنگی قوربانیدەرانی خاکەوە، هەرلەوێ یەکەم فیشەکی ئــازادیخوازان نــرا بــەقوفڵی ســەردەرگا ئەڵقــە ڕێزکراوەکــانی ســەر ئــازادییەوە. ســەردەمانێ لەوێ لەهەمــوو چەشــنە کانزاکــان دروشــمی چەکوش و داسێکی قەدەغەکراو دەکران بە بەرلانک و دەسرازەو بەروانکەی منداڵە ساواکانەوە تا منداڵان چاویان بەڕەنجی باوکە هەژارەکانیانەوە هەڵبێ. کچانی ئەم گەڕەکە کچانی هەر هەموو گەڕەکەکانی تری شاریان هاندەدا گوڵی سوور بدەن لە ئێخەو پەرچەمیان. نینۆکی هەر دەپەنجەیان بە ڕەنگی قوربانی ڕەنگ بکــەن. گەورەو بچــوک ئێــواران کــاتی خۆرنــشین دەچــوون بــۆ بــاخی مــیر، ئەو بــاخەی تەواوکەری

جوانییەکــانی کــانی عاشــقان بــوو. لەویٚ دیوانــی شیعرەکانی گۆرانیان لەباخەڵیان دەردەهێناو بەخەیاڵی عاشـقانە گـوڵە هەنـاری هەمـوو باخەکەیـان سـوورتر دەکرد، . گوێیان لە هۆرە و سیاچەمانە دەگرت. لەگەڵ چریکەی ئەواندا هەستت دەکرد باخی میر ئەوەندەیتر سـەوزتر دەبێت و بـاڵای درەختەکـانیش هەڵدەکشێن. هــەر لــەم گەڕەکــەدا عیرفانــە ئیمانــدارەکان وتیــان: باهەموو گەڕەکەکانی شار بەشداربن لـە خوێندنـەوەی ئــەو کتێبــە قەبانــەی زانــا مــردوو و زینــدوەکان نووسـیویانن. ئـەوان هەمیـشە بـەکڵاو و سەرپۆشـە ســپییەکانی ســەریان و ڕیــشە تەنکەکانیانــەوە دەناسـرانەوە کـە ئیمانـدارە تووڕەکـانن. لـە ڕاسـتیدا کـەس نـازانیٚ ئـەم گەڕەکـە مێژووەکـەی بـۆ کـەی دەگەڕێتـەوە. ئەوەنـدە نـەبێت هـەر جارێک ئـەم شـارە وێرانـەخاک کرابیٚ یەکـەمجار شمشێر خراوەتـە سـەر گـەردنی ئـێرە، هـەر جـاریٚکیش مـاڵێکی تیـا ئـاوەدان کـرابێتەوە شــەقامێکیان لــەم گەڕەکــە ســڕیوەتەوە. هـــەرکاتیٚ درەختێکیـــان تێـــدا چانـــدبیٚ خەڵفـــە خۆزگەیەکیان تیا هەڵکێشاوە. لەم گەڕەکە سەوزەدا کەشار هەموو چاویان بەجوانی ئەو دەڕشت لاسایی ئارایــشتی داروبــەردو ڕازاندنــەوەی جوانییەکانــی

ئـەویان دەکـردەوە. ژووره تەنیاکـەی عـەلی لـەوێ بـە خـــەیاڵی هونەرمەنـــدێکی میهرەبـــان ســـواغ درابـــوو. هەمیـــشه وێنـــەی کۆتـــره هاقووەکـــان لەســـەر تاقـــی پەنجـەرەکەی گمـەیان دەهـات. ژووره تەنیاکـەی هـەر هێندەی مـاوەی داره دارەی سـاوایەک بـوو تـا دەگاتـه ئامێزی کراوەی دایکی، بەڵام پڕبوو لەپەیکەری هێشتا ڕۆح بە بـەردا نـەکراو. پەیکـەری کچێکی باڵابـەرز، کە بەتـــەنیا بـــە چاوەکـــانی دەیتوانـــی تورەببێـــت یـــان زەردەخەنـــە دابـــەش بکـــات، یـــان بگـــرێو بـــەچاوە گەورەکانی لەگەڵ عەلی بدوێو دڵنەوایی بکات. عەلـی بـە فڵچەکـەی دەسـتی کـە هەمیشە لە کـاتی کارکردنـدا لێزانانە لـەنێوان دووپەنجـەی دەسـتی ڕاسـتیدا چەسـپ بـوو، وەک ئـەوەی نـەهێڵێت هیـچ ئەندامێکی جەسـتەی خۆی پێی بزانێت. بە هێمنی فڵچەکەی دەگـرتو دەیـان وێنەی گەورەو بچووکی ئاویی دەکێشا. عەلی ئیـتر لـە دوای ئـــەو ســـاتەوە کەیـــەکاڵا بـــۆوە لـــە ئەندێـــشەی تاقیگـەکان. خـۆی تێکـەڵ بـە هـەموو ڕەنگـەکان کـرد، تەنانەت لەناو هەموو ڕەنگەکانی نێو پەلکە زێڕینەشـدا وێنـەی دروسـت دەکـرد کـەس نەیدەزانی کـێو بۆچـی هێنـــده پـــێی سەرســـامە. عـــەلی لـــە وڵاتـــی غەریبیـــدا خوێندنەکـــەی لـــە ئـــامێزی دایـــکه هاجەریـــدا لەبـــواری

زەویناسیدا بوو. ئەو دەیزانی چینەکانی زەوی وەک مرۆڤ هەرچینەو ڕەنگی خۆی هەیەو بەتایبەتمەندییەکانیەوە دەناسرێنەوە دەیزانی باسکردنی چینێک لە جێگەی چینێکی تر گەمژەییەکی چەند گەورەیە. لەوێش لەناو چینە بەردەکاندا خەیاڵی دەخستە ناو قوڵایی بەردەکانەوە. هەندێ جار لەسەر پشتی گابەردێک وێنەی مامزو کاریلە کێویەکانی دروست دەکردو هەرخۆیشی بە هاوڕێکانی دەگوت: هاوڕێیان گوێتان لە دەنگی قاڕەقاڕو دەنگدانەوەی دەنگی ترپەی لاقە بچکۆلەکانیانە لەکاتی یاریکردندا. لەوێ لەسەر ئەو گابەردانە سمکۆڵانی ئەو ئەسپانەت دەبیست کە لە تابلۆیەکی گەورەدا سمکۆڵانیان دەکرد و پڕ بەژوورەکەی عەلی دەیان حیلاند. بە جۆرێک تۆ وا هەستت دەکرد هەر ئێستا نا تاوێکی تر چوار چێوەی تابلۆکە دەشکێنن و بە چوار ناڵە دێنە دەرەوە. هاوڕێکانی عەلی هەمیشە سەرسامی شتێک بوون کە نەیاندەتوانی لە عەلی بپرسن، یان هەر بیر لەو پرسیارە بکەنەوە تاوەکو بزانن ئەو کەسە کێیە، کە بەسەدان تابلۆی جۆراو جۆر گوزارشتیان لە نیگایەکی ئەو دەکرد. کە نیگای هیچ تابلۆیەک نەدەچووە سەر نیگای تابلۆیەکی تر. هەندێ تابلۆی

هەڵواسییبوو باسی لەتێکەڵکردنی مەرگ و ژیانی دەکرد، کە بەتەنیا لە چاوی ئافرەتێکدا کێشرابوو هەر خۆی دەیزانی چۆن چۆنی زەردەخەنەو خەمی تێدا جیا بکاتەوە. بنمیچی ژوورەکەی عەلی بە وێنەی دایکێک کێشرابوو بە ئاشکرا دڵۆپ دڵۆپ میهرەبانی لێدەتکا بەجۆرێک هەموو ڕاخەری ژوورەکەی تەڕدەکرد. بۆنی گوڵاوی دایک لە ژوورەکەی دەهات، بەهەرچوار لای ژوورەکەدا تەنانەت لە سوچی چێشتخانە بچوکەکەیدا دەیان میناتۆر نەخشێنرابوون، هەر بە چاو بەخێرهاتنی میوانەکانی عەلیان دەکرد. لە سەر کونی کێلونی ژورەکەو لەسەر تاکە داخراوەکانی پەنجەرەو هەموو دەرگاکان بە میناتۆر نەخشێنرابوون هەر بەڕوانین دەتزانی هەریەک لەو میناتۆرانە چیدەڵێن. سحری ڕوانینماڵەکەی کردبوو بە سەمفۆنیایەکی بێدەنگ. هەرهەموویان بەبێدەنگی دەدووان دەتتوانی گوێ بگریت یان تێبگەیت کە چۆن چۆنی دەیانەوێت بکەونە جوڵەو سەرنجدان. لە ناو هەر تابلۆیەکی چاودا کە بە دەیان تابلۆی جیاواز جیاواز هەڵواسرابوون وێنەی کچێکی بالآبەرز و هەندێکیان نەخشەی قژێکی درێژوو هەندێکیان کراسێکی گوڵ گوڵی تێدا کێشرابوو. بەتەنیا هەر عەلی

دەیزانـی نهێـنی ئەو تابلۆیـانە چییـە. لـەزۆر میـناتۆردا دەیویست ئەو بۆنە خۆشانە بدۆزێتـەوە کە لـە وێنـەی تـاڵ تـاڵی قـژە درێژەکـەو تـابلۆ باڵابـەرزەکانو تـابلۆی کراسە گوڵ گوڵیەکە جۆرە بۆنێک دەربهێنێت جیاواز لە بۆنی ئەو تابلۆیەی بۆ هاجـەری دایکـی کێشابووی، هاورێکانی دەیان گووت: عەلی ئێمـە هـەمووومان بۆنـی قـژ و سنگی دایکـی خۆمـان دەکـەین لـە ڕوانیـنی ئـەو تابلۆیەدا. ئـەو هەمیشـە وەک هونەرمەندێکی بلیمـەتو خوڵقێنـەر کـە بیـەوێت تابلۆیـەک بکێـشێت قسـە بکـاو گــوێ بگــرێو وەڵام بداتــەوە. تابلۆیــەک پێبکــەنێو بگرێو پەشیمان بێتەوە لـە تورەیی نووکـی فڵچەکـەی دەخستە نێوان پەنجـە کەڵـەو پەنجـەی شـایەتمانیەوە. نوکـی فڵچەکـە بـەلای چـەپی کۆتـایی پەنجـە گەورەیـدا تێپـەڕ دەبـوو. خـەریکی وێنـە کێشانی تابلۆیـەک بـوو قژێکــی درێــژ تــاخوار کەمەرە باریکەکــەی دەکــشا. سێبەرێکی ڕووناک سـەری نـابوو بـە ناوەڕاسـتی قـژە درێژەکەوە. سێبەری پیاوێک بـوو دەیویـست مەسـتانە خــۆی لــە بۆنــی ئــەو قــژە تــێر بکــات. لــە شــێوەی ڕێکخستنی قـژە درێـژەکەدا دەتتوانـی بۆنـی تـاڵ تاڵـی ئــەو قــژە بکــەی کــە وەک یــاڵی ئەســپێکی ڕەســەن شۆڕببووەوە. هەستت دەکرد ئاونگی بۆنەکـە دەکەوتـە

سەر دەستتو دەستەکانت بۆنی بەهەشتیان. لێدەهات. بۆنێک بە ئاسانی دەچێتە ڕۆحتەوەو تا هەتایە دەرنایەت. لە تەنیشت ئەوەوە تابلۆیەکی بۆنداری تری کێشابوو، تابلۆی دارسێوێک بە سەدان سێوە لاسورەی گرتبوو، بایەکی هێواش دارسێوەکەی ڕادەژەند، بێئەوەی گەڵایەک بوەرێت، یان چڵێ لە دارسێوەکە شکا بێت، بەڵام لە ژێر دارسێوەکەدا سەدان مەلو مور، دەیان چۆلەکە و کۆترو پەلەوەر مردبوون. یان لەکاتی گیانەڵادابوون. بۆنی ژەهرەکە دەگەیشتە قورگمان چاو و گوێو لوتمان دەکزایەوە. هەمووبمان خەریک بوو بخنکێین. گەلێ وێنەی سەرسوڕهێنەری لە بۆنی قژی ئەو کچەو سحری چاوەکانی دەرهێنابوو. کردبووی بە تابلۆی سەیر سەیر. وەکو تابلۆی خونچەیەک لە ژێر تیشکێکی دزەکردودا لەکاتی پشکوتندا. یان قژێکی بەر شەپۆلی نەرمەبایەکی خێرا تەنانەت هەستت بە ڕەنگ و بۆنی تیژی باکە دەکردو دەتتوانی خێرایی باکەش بپێویت. لە تابلۆیەکی تردا هەر هێندەی چاوی مامزێکی حەپەساو چڵە نێرگزێک بە قژێکی درێژ داپۆشرابوو، لە هەندێ جێگەداشەونمی وردو درشت بەسەر گوڵەکەوە نەخشابوو. لە تابلۆیەکی لەو بچوکتردا

وێنەی چڵە ڕێحانەیەکی گەشاوە بە خۆری بەیانی لەناو گەڵایەکدا بە شێوەی قژێکی هەڵوەریو دەبینرا کە ڕەنگی لەگەڵ ڕەنگی چڵە ڕێحانەکەدا دەگونجا هەستت دەکرد سروشت خۆی نەخشاندوویەتی بۆیە ڕۆحت بۆ بۆنکردنی گەڵای جاترەو ڕێحانە کێویلە دەبزوا. ڕۆژانە بۆ چەند ساتێک عەلی لە ژوورە تەنیاکەی خۆیدا پاڵدەکەوت دەیڕوانیو هیچی نەدەگوت. لە ناکاو بزەیەک وەک سەرەتای سەر دەرهێنانی چڵە گەنمێک وردە وردە باڵا بکاتو ببێت بە خەندەیەکی شیرین، ئیتر قاقا دەکەوتە پێکەنین، بیری کەوتەوە دەیگوت: دایکە هاجەرم هەمیشە دەیگوت ڕۆڵە عەلیەکەم هەناو و بەندی جگەرم وازبێنە لە وێنەکێشانی زیندەوەر. دەستم دامێنت عەلی پەشیمان ببەرەوە لە گوناە. هەموو دەمرین عەلی هەموومان گیای مردنین. مەرگم پێش مەرگی تۆ کەوێت. دوایی ئاخر چۆن گیان دەکەیت بە بەری ئەو زیندەوەرانەی بە دەستی خۆت کێشاوتن. عەلی کوڕم پەشیمان ببەرەوە لە گوناە.

عەلی لەبەر خۆیەوە دەیگوت: یادت بەخێر دایە، ئەگەر ئێستا لای کوڕە تەنیاکەی خۆت بویتایەو ئەم هەموو تابلۆو وێنانەت بدیایە چیت پێ دەوتم، دەزانم

بـەرۆكی گونـاه باریـت ڕادەتەكانـدمو دەت گـووت؛ مەگەر هەرخوا بتبەخشێت سنووری گوناهی بچووكت تێپەڕانـدو واخـەریكی گونـاهی گـەوره كردنیـت. عەلـی لەبـەر خۆیـەوه پێدەكـەنی تـا مەسـت دەبـوو. ئینجـا دەیدایه قوڵپی گریـانو دەیگوت یـادت بـەخێر تەنیایی چەند سەختە دایە. . !

***

عەلی نەیدەزانی بۆ هێندە نیگەرانە لە ئەنجامی تاقیگـەکان، تـا ئەودەمــەش هێـشتا وێنــەی هۆڵەکــەو دانیـشتوانی لــە پێـش چـاو کـاڵ نەببـۆوە، ئەگەرچـی بەدەگمـەن دەچـووە دەرەوەو تـازۆر پێویـست نەبوایـە ژوورە تەنیاکەی خۆی جێنەدەهێشت. هەر ئەوەندە لـە شــوێنێکی پــەراوێزکراوی شــارەکەدا دەچــووە ســەر کارەکــەی و زۆر بــەخێرایی دەگەڕایــەوەو خەریکــی ڕێکخستنی کارە هونەریـەکانی دەبـوو. لـەو ماوەیـەدا یەک دوو جاریش ئێواران درەنگانێ بـەلای هۆڵەکـەدا تێپـەڕ بوبـوو. لەڕاسـتیدا چـاوی بـەرایی نـەدەهات بـە تـەواوەتی تەماشـای هۆڵەکـە بکـات. حەزیـشی دەکـرد جـگە لەوێـنەی کـچە بـاڵابەرزە قـژ درێـژەکە وێنــەی ئامــادەبوانی هۆڵەکــە لــە بـیر خــۆی بەرێتــەوە، کــە ناخۆشــترین چیرۆکــی مەرگەســاتی لــەوێ بیــست، ئەگـەرچی حەقیقـەتی کارەسـاتەکەی لـەوێ زانـی کـە

بەڕاستی چی لەشارەکەیدا گوزەراوە، بەڵام هەمیشە چیرۆکی خۆیو کچە باڵا بەرزە قژدرێژەکەی لە پێش چاو ون نەدەبوو، لەڕاستیدا هەر بەو چیرۆکە پەنهانو تەواو نەکراوانەیشەوە دەژیا. وایشی هەستدەکرد ئەو چیرۆکە پچڕ پچڕو تەواو نەکراوانەی نێوان خۆی و کچە باڵابەرزە قژدرێژەکە بەشی هەموو تەمەنی دەکات تاپێی بژی و هەست بە بێکەسی خۆی نەکات. عەلی کاتێک لەگەڵ دایکە هاجەریدا دەژیا، دەیان چیرۆکی دەربارەی مرۆڤە پەناهەندەو پەرتەوازەکان خوێندبوەوە. لەو کاتەوە سەرەتای چیرۆکەکەی خۆیان بە ناتەواوی بۆ گێڕابۆوە. بەشوێن ئەو کارەساتانەدا دەگەڕا کە لە ریپۆرتاژو بەسەرهاتەکاندا دەنووسراون هیچ ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (هاوڵاتی) لە دەست دەرنەدەچوو کە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بوو لەیەک کاتدا بەهەموو وڵاتدا بڵاودەکرایەوە. بەیانیان زوو زۆرجار پێش کردنەوەی دەرگای ڕۆژنامەفرۆشەکان دەگەیشتە ئەوەێ و چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژنامەکەی دەکرد. هەر کە ڕۆژنامەکەی دەکڕی ئۆقرەی نەدەگرت دەکەوتە گەڕان بەشوێن لاپەڕەی (خەمی هاوڵاتیان)و بەشوێن کارەساتی پڕ لەمەینەتی

پەناهەنـدەو ئـاوارەو بێدەرەتانەکانـدا دەگـەڕا. حـەزی دەکــرد مــاڵ بــە مــاڵ ، کــۆڵان بــە کــۆڵان شــاری ئەسفەهان تەیبکات، لـە دەرگـای هـەموو ماڵێک بدات هەواڵی ژیانی ئەوانە بزانێت پەناهەندەو سەرگەردان‌و بێ کـەس لـە شـارەکەدا دەژیـن، لـە ڕاسـتیدا ئەمـەی دەکرد. بـەڵام لـە ئـەنجامی گـەڕانێکی زۆر بـە شـوێنی جیا جیای شاری ئەسفەهاندا بۆی دەرکەوت؛ ژمارەی ئەو پەناهەندە و ئاوارانە هێندە زۆرن نە بەم دەکرێ‌و نـە بـەم دەدۆزرێنـەوە. بۆیـە وازی لـەم ئارەزووەشـی هێنــاو بڕیاریــدا لـــە ژوورە تەنیاکـــەی خۆیـــدا بە هـونەرەکەی بـۆ ئـازاری بـێ کەسـی خـۆی‌و هـەموو ئەوانیش بگەڕێت.

***

لـەو مـاوە دوورو درێـژەدا عـەلی بـەردەوام لـە ژوورە تەنیاکـەی خۆیدا کاریدەکرد چەند هاوڕێیەکی پەیدا کردبوو کە لەپەنجەی یـەک دەست تێنەدەپـەڕین، هەر ئـەوانیش عـەلییان وەک هونەرمەندێکی بەسـەلیقە دەناسـی، چونکـە عـەلی لـە دوای خۆپـەراوێز کردنـی کەسـی وای نەدەناسـی، تـادەردە دڵـی خـۆی لا هـەڵبڕێژێت. لـەبری ئەو هـەموو ئەندێـشە تـاڵانەی، لەگەڵ تابلۆکاندا دەژیاو چیرۆکی خۆی بۆ دەگێڕانـەوە زۆرجاریش لەگەڵ تابلۆکاندا دەکەوتـە دەمـە بۆڵـەو لـە یـەکتری زویردەبـون. بـۆ مـاوەی چەنـد کاتژمێرێـک ڕووی لـەتابلۆیەک یـان چەنـد تابلۆیـەک وەردەگـێڕاو دواتر هـەر خـۆی داوای لێبوردنـی لێدەکردن و ئاشـت دەبوەوە لەگەڵیانداو، دەکەوتە پاککردنەوەی تابلۆکان‌و بەدەنگە خۆشەکەی بە سۆزێکی بە کوڵ گۆرانـی بۆ دەگـوتن. زۆر جـاریش بـەدەم گۆرانییـەوە خـەو

دەیبردەوە و دەنووست. عەلی بەیانیان هەرکاتێک لە خەو هەستایە، بەبێ جیاوازی بەیانی باشی لە هەموو تابلۆکان دەکرد. لە نیگای کچە بالأبەرزە قژدرێژەکە ورد دەبۆوەو سەرنجی دەداو هەرنیگایەکی بە جیا لەتابلۆیەکدا بەسەر دەکردەوە، بە تایبەتی ئەو ڕۆژانەی لەماڵەوە دەمایەوەو نەدەچووە سەرکار زۆرجاریش بۆئەوەی تابلۆکان بێزار نەبن دەچووە بەردەم تابلۆیەکی کە لەوساتەدا لە هەموویان زیاتر سەرنجی ڕادەکێشا، گۆرانیەک یان بەسەرهاتێکی غەریبی خۆی بۆ دەگێڕایەوە. عەلی زۆرجار هەستی بە هونەری گوێگرتنی ئەوان دەکرد دەیزانی کام تابلۆیە گوێناگرێو هەر قسە دەکاتو هیچیتر. کام تابلۆیەش حەز بە قسەو سکالأکانی تەنیایی ئەم دەکات زۆرجاریش دەستی بەسەر شان و ملی پەیکەرە بەردینەکانیدا دەهێناو فرمێسکی چاوی ئەوانەی دەسڕی کە بۆ تەنیاییەکەی عەلی دەگریان و سەر و پرچو شانو ملی بۆ دەتەکاندنو زۆرجاریش حەزی دەکرد دەستیان بگرێت و لە ژوورە تەنیاکەیدا پیاسەیەکیان لەگەڵدا بکات، بەلأم هەرچی دەکرد نەیدەتوانی. هەرکاتێکیش بیری دایکە هاجەر تەنگی پێهەڵچنیایە هەر ئەو چیرۆکەی بۆ دەگێڕانەوە کە

هەموو تابلۆ و پەیکەرەکان لەبەریان بوو دەشیانزانی وەکو عەلی بیگێڕنەوە، عەلی دەیگووت: کە ئارەزووی تەنیایم دەکرد ئەسفەهان بەو گەورەییەی خۆیەوە بچووک دەبووە بەقەد توانای فڕینی باڵی مێش هەنگێک. منیش بەدوای فڕینی خەیاڵەکانی خۆمدا شوێن پێی ئەوم هەڵدەگرت و دەڕۆیشتم تاژێر سێبەری (درەختی چناری چەند سەد ساڵە) نەدەوەستام. لەوێ لەژێر ئەو درەختە پەلو پۆ گەنجەدا دادەنیشتم. بیرم لە تەنیایی خۆم و دایکە هاجەرم دەکردەوە، کاتێک دایکم بە غەمگینی منی دەبینی بێئەوەی پرسیار بکات بۆچی دڵتەنگ و غەمگینم. لە بێدەنگیەکەم ڕادەماو بارانی فرمێسک بەسەر چڵ و لق و پەلە سەوزەکانی بالآیدا چۆڕاوگەیان دەبەست. من ئەو دەمە حەزم نەدەکرد دایکم شتێک بدرکێنێت بڵێ؛ عەلی ئەمە داستانی ڕاستەقینەی تۆیە، یان دڵخۆشیم بداتەوە بڵێ؛ عەلی من دایکو باوکو هەموو کەسوکاری تۆم. تۆ بێکەس نیت ئەو تابلۆیەی بەسەر چرپاکەتەوە هەڵواسراوە ئەوە تەنها شاری تۆ نییە کە ژەهربارانکراوە. ئەوە شاری هەموو مرۆڤەکانی سەر گۆیی زەوییە، کاتێک بەراورد لە نێوان هێزی شەڕانگێزی مرۆڤ و هێزی

خۆشەویستی مرۆڤدا دەکرێت، بەڵام دایکم هیچ هەر هیچی نەدەگووت لەو بارەیەوە. تەنانەت بەگوێی خۆم گوێم لێ نەبوو یەکجاریش لەپێش چاوم لەو تابلۆیە بڕوانێت. ئیتر نازانم بۆ؟ لە ژێر سێبەری دارچنارە گەورەکەدا هەڵدەستام دەڕۆیشتم بە شەقامی چوارباخدا تێدەپەڕیم، ئەویش شەقامێک بوو لە جوانی دروستکرابوو. باخچەی کەنار شەقامەکە بەگوڵی ڕەنگاو ڕەنگو درەختی تایبەتی ڕازا بۆوە ڕێک وەک ئەو درەختانەی مرۆڤ جوانییان لەگەڵدا بەراورد دەکات بەجوانییەک کەخۆی ئارەزووی دەکات. دەڕۆیشتم تا دەگەیشتمە (کۆشکی هەشت بە هەشت) بە یەک دوو هەنگاو خێرا دەچوومە ژوورەوە، بیرەوەری ئەفسانەو ڕووباری هەنگوینی شیعرو درەختی پڕ میوەی بەهەشت تا دڵ حەز بکات بۆنی خۆشی ئەوانم هەڵدەمژی، تامی چیرۆکی بەرگری ئەوانم دەکردو، سەیری هونەری ئەو دەست و پەنجانەم دەکرد کەچەند دڵسۆزانە بەهەشتیان بەڕووبار و باخ و جوانییەکانییەوە گواستۆتەوە ناو ئەم کۆشکە.

***

دەستو پەنجە ڕەنگینەکانی عەلی هەموو هاورێکانی خۆی مەست کردبوو بەجوانی. یادکردنەوەی کارەساتی شانزەی سێ نزیک ببووەوە. هەموو ساڵێک فیستڤاڵێکی بۆ ڕێکدەخرا . هاوڕێکانی کەوتبوونە کەڵکەڵەی هاندانی عەلی تا لەو یادەدا بە پێشانگایەک بەشداری بکات، با چەند تابلۆیەکیش بێت گرنگ ئەوەیە ئەم بەشداری بکات و بەم کارەشی هەندێ لە توانای خۆیو خەمەکانیشی ئاشکرابن. عەلی ڕازی بوو لە دڵەوە حەزیشی دەکردو دەیگووت؛ بەڵکو کچە قژدرێژە باڵا بەرزەکەش بێتو نیگا سحراویەکانی خۆی بناسێتەوە. هاورێکانی عەلی هەموو تابلۆکانیان بردوو هۆڵێکیان بۆ ڕازاندەوە کە تایبەت بوو بە ڤێستیڤاڵی کارەساتی شانزەی سێ. لەسەر داوای هاوڕێکانیشی عەلی ڕازی بوو پێشتر نەچێتە هۆڵی پێشانگاکەوە، بەڵکو لەگەڵ خەڵکەکەدا

هۆڵەکە ببینێت کە تایبەت بوو بەکارەکانی ئەو کاتێک ڤێستیڤاڵەکە دەستی پێکرد عەلیش لەگەڵ میوانەکاندا چووە ژوورەوە. هاوڕێکانی عەلی بەشێوەیەک هۆڵەکەیان ڕازاندبۆوە عەلیشی سەرسام کردبوو لە هونەری هەڵواسینی تابلۆکانو گونجاندنی هەریەکێکیان لە شوێنی خۆی بە جۆرێک هەڵواسرا بوون کە بینەرێک سەرەتا بێتە ناو پێشانگاکەوە واهەست بکات هەموو تابلۆکان بەتایبەت ئەو تابلۆیانەی سحری چاوی کچە قژدرێژە باڵابەرزەکەی تیا دەدرەوشایەوە، بەخێرهاتنی ئەو دەکەن. هەموو گوڵەکان بۆن ڕێژیان دەکەن و هەموو پەیکەرەکان سەریان بۆ دادەنەوێنن. پێشانگاکە جۆرێک بوو لەو جۆرانەی تاخۆت بەچاوی خۆت نەیبینی باسکردن دەربارەی لە هونەرو جوانیەکانی هەڵدەوەرێنێ. سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە کەرنەڤاڵی شار دەستی پێکرد بەسەدان میوانی بیانی لەمیوانە چاو شینەکان و پێست ڕەشەکان و باڵا کورت و باڵاهەرە بەرزەکانی مرۆڤی ئەم سەرزەمینەی بۆ هاتبوون ئامادەبوان هەریەکە بە جۆرێکی تایبەتی کە خۆی خواستبێتی خۆی ڕازاندبۆوە. هەزاران ژن و منداڵ و تەنانەت پیر و پەککەوتەکانیش بە سواری عەرەبانەکانیان و

بەهۆی دار شەقەکانیانەوە بەشداریان تێدا کردبوو. هەموو ئەو بازرگان و هونەرمەند و ئەدیب و سیاسی و تەنانەت نوێنەری هەموو ئەو کۆمپانیایانەش هاتبوون کەکڕیارەکانیان کاتی خۆی ئەم ژەهرەیان بە دیاری ناردبوو بۆ دۆستە کڕیارەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی سەرزەمین و بووە هۆی کوژرانی هەزاران کەس و بریندارکردنی دەیان هەزاری تر و بزربوونی سەدان منداڵی ساوا کە هەتا ئێستاش کەس نازانێت چارەنووسیان چییەو لە کوێن. تیشکی خۆر تازە خەریک بوو لەئاسۆی شاخی شنرویوە دەردەکەوت سەرەتا میوانەکان چوونە ناو ئەو مۆنۆمێنتەی لەبەشی خوارەوەی شارەکە بەشێوەیەکی مۆدێرن دروستکرابوو کەتێیدا پەیکەری پێنج هەزار شەهید بەتەنیشت یەکەوە دانرابوون ناو و نازناو و تەمەنی هەریەکێکیانی لەسەر تۆمارکرابو، ئامادەبوانی ڤیستیڤاڵەکە بەجۆرێک سەرسام بوون مرۆڤ شەرمی لەمرۆڤایەتی خۆی دەکردوو لەدڕندایەتی هەندێ مرۆڤ دۆش دادەما، زۆربوون ئەوانەیش کە بەدەستە سڕ و لەپی دەستەکانیان فرمێسکی چاویان دەسڕی و تەنانەت نوێنەری هەندێ لە کۆمپانیا چەک فرۆشەکان هێندە سەرسام بوون بە کاریگەری چەکەکانیان

هـەردەیانڕوانی و هیچیان نـەدەگوت. بەڵام چین چین ئــارەقەی شــەرمەزاری لــەناو چــاوانی هەنــدێکیان دادەچـۆڕا. عـەلی هەسـتی بـە شـانازییەک دەکـرد کـە وەک قوربانییـەک لـە کەرنـەڤاڵی ئەمـساڵدا بەشـداری دەکات. ئەو هۆڵەی ئەو تابلۆکانی تێدا نمایش دەکرد دەکەوتــە ناوەنــدی شــارەکەوە بــەڕاڕەوێکی باریکـدا تێدەپەڕیو ڕێک دەچووە نـاو هۆڵەکەوە. عـەلی لـەناو هۆڵەکەدا هەر هات و چۆی دەکرد. بەردەوام وەڵامـی ئامادەبوانی دەدایەوە هێندە سەرقاڵ بـوو هەندێ جار نەی دەتوانی تابلۆکان وەک ئەوەی مەبەستی بووە لـە کێـشانیاندا بــۆ ئامــادەبوانی ڕونبکاتــەوە زۆرکــەس گلـەییان لـێ دەکـرد کـە بۆچـی تائێـستا تـابلۆی ئـەم هونــەرە گەورەیــە نمـایش نــەکراوە زۆر کەسـیش لـە هۆڵەکـەدا عـەلیان ناسـییەوە دەسـتیان دەخـستە نێـو دەستیەوەو لێیـان دەڕوانـی وەک دارێکـی هەڵکەنـدراو دەست بەجێ لە جێیەکی تر بنێژیتەوە و هـەر سـەوزو پــەلوپۆ گەشــاوە لێیــان دەڕوانــی. عــەلی بــە هــەموو شـێوەکانی وتـن بـە چـاو و بـە لێـو بـە دەسـت و بـە هەڵتەکاندنی شانەکانی و هەموو جۆرەکانی تر لە وتن باسی لەنهێنی تابلۆکانی خۆی دەکرد. لێیان دەپرسـی ئایــــا بــــۆ زۆربەی تابلۆکــــانی بــــەڕەنگی ئــــاوی

کێشاونی؟پرسیاری زۆر شتی تریشیان لێدەکرد، کە پەیوەندی بە پێشکەوتنی بیری هونەری ئەوەوە هەیە وەکو هەوڵدان بۆ وێنەکێشانی بۆنی سێو. بۆنی عەتری لەشی ئافرەتێکی نەناسراو. هۆڵەکە چەند ڕۆژنامە نوسێکی لێبوو هەندێکیان نوێنەری تیڤی و ڕادیۆ جیهانیەکان و لۆکاڵیەکانیش هاتبوون. جگە لەهەموو ئەو ڕۆژنامە ئەهلی و حکومیانەی ئامادە ببوون، هەریەکەیان بەشێوەیەکی جیا لەویتر پرسیاریان دەکرد وعەلیش بەکورتی وەڵامی هەموویانی دەدایەوە. دەیان پرسی ئەم نیگا سحراویانە چین هەریەکە بەجیا لە گۆشە نیگایەکەوە دەڕوانێت جیاواز لەوانیتر. عەلی هەندێ سەرەداوی گرنگی دەدانێ، ئیتر خۆی بێدەنگ دەکرد. بەخەندەیەکی شیرینەوە دەیگوت بینەری زیت و وریا ئەو بینەرەیە چیرۆکی نیگای هەرتابلۆیەک بخوێنێتەوەو لەنهێنیەکانی تێبگات. یان بەشوێن نهێنییەکانیدا بگەڕێت. پرسیاریان لەو تابلۆ گەورەیە دەکرد کەشارێک دەسوتێ و گشت ماڵ و خانوەکانی لە ناو ئاگرەکەدا نابن بە خۆڵەمێش، بەڵکو تەمێکی سپی دایان دادەپۆشێت. دەیان پرسی هۆی چییە ژنێکی خان و مان لە ناو ئەو شارە پڕبڵێسەو گڕەدا

دەگەڕێ و ناسوتێ؟عەلی دەدواو وەڵامی دەدانەوەو هەندێ جار هۆن هۆن فرمێسکی لەچاوان دەهاتە خوارەوە. سەراپا پێشانگاکە بەڕەنگی سەر سوڕهێنەر نەخشێنرابوو تێکەڵکردنی ڕەنگەکان بەو شێوەیە نەبوو کەزانیاریی مامۆستا ئەکادیمییەکان باسی لێوە دەکەن. بەڵکو تێکەڵکردنی ڕەنگەکان بە جۆرێک بوو ڕوانینی بینەری ڕادەگرت بەو چەشنەی تابلۆیەک لەلای ڕاستەوە لێیت بڕوانیایە شارێکی جەنجاڵە و لەلای چەپەوە لێت بڕوانیایە هەزاران مرۆڤ مردوون و کەس نییە نیگایەک بگرێتە ئەوی تر. لە ناوەندی تابلۆکەدا کچێکی قژدرێژ یەک بەیەک ئەو لاشە مردوانە هەڵدەگرێ و دەیانباتەوە بۆ شەقامێک لەو شارە جەنجاڵەدا. هەروەکو چۆن منداڵێک وردە ماسی گوێ چەمێک دەخاتە قاپێک ئاوی لێڵەوە تا بژین. ڕۆژنامە نوسەکان هەردەهاتن و دەچون بەجۆرێک نەیان دەزانی چی بڵێن دەربارەی ئەو پەلکە زێڕینەی بەسەر شان و ملی کچێکدا هاتبووە خوارەوە بەڵام ڕەنگەکان پێچەوانەی ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە ڕیزکرابوون. هەندێ کەس لە پێچەوانەکردنەوەی ئەم ڕەنگانە سەرسام یاخود تووڕە بوون. عەلی شەکەت و ماندوو هەڵدەسوڕا و ئەویش وەک بینەرێک جار نا

جـــار بەئەســـپایی ڕووی دەکـــردە تابۆکـــان و پێـــی دەگـــووتن مەترســـێن هێـــشتا خـــەڵکەکە بەحەقیقەتـــی کارەســـاتەکە نـــازانن. کەلـــەپاڵ پەیکەرەکانـــدا دەوەســـتا لەبەر خۆیەوە دەیگووت مەترسن بەرگەی لۆمەی ئەو خەڵکـە بگـرن تاهـەموو خـەڵک لەڕاسـتیی ڕوداوەکـە تێـدەگەن ئـەو دەیگـوت هەمیـشە حەقیقـەت سـەرەتا هەروایە، بەسانایی پەسەند ناکرێت. قوربانیی ئێوەش هـەر بێدەنگییـەو خۆڕاگـری، بەرامبـەر ڕەخنـەی ئـەو خەڵکـــەی کە دەیانـــەوێت خۆیـــان بەو شـــێوەیە کارەســـاتەکان بـــۆ نەوەکـــانی ســـبەینێ بگـــێڕنەوە کە خۆیان دەخوازن. نزیکەی یەک کاتژمێر لـە کردنـەوەی پێـــشانگاکە تێپـــەڕبوو. بـــەلای کەمـــەوە بەچەنـــد کاتژمێرێـک ئینجـا دەتتوانـی کلیلـی کردنـەوەی نهێنـی تابلۆکـان وەربگریـت. ئـەی ئـاخۆ بەچەنـد کاتژمێـر لەتـەواوی نێهێـنی چیرۆکـی هەرتابلۆیـەک تێبگـەیت. لەناکاو ژاوەژاو وەک هەڵکردنی ڕەشەبایەکی ناوەخت هۆڵەکەی خستە دۆخێکی نائاسییەوە. ئیتر هەرکەسە بە جۆرێک دۆخەکەی لێک دەدایـەوە دەیـانگوت ڕەنگە بۆمبێک لـەو بۆمبە کیمیاویـانەی تائێستاش هـەرماون نەتـەقیبێتەوەو جـارێکی تـر شـارەکە ژەهرخـواردوو بکـات. یـان دەیـانگووت مەترسـی هەڕەشـەی ئـەوەیان

بیستووە کە پەیکەری ژن و پیاو پێکەوە گوناهێکی گەورەیەو دەبێت هەموو پەیکەرەکان تێک بشکێنرێت و تابلۆکان بسووتێنرێن بەتایبەتی ئەوانەی لەزەت و شەهوەتی خەڵکی تر دەبزوێنن. زۆر قسەو باسی بێ بنەماو زۆر چیرۆکی سەیرو سەمەرەیان باس دەکرد، عەلی تەواو ترسی لێ نیشتبوو. نەیدەزانی چیبکات چۆن دەتوانێت دەست لە ڕەنجی ئەو هەموو زەحمەتە درێژەی خۆی هەڵگرێت عەلی دەیپرسی. هۆی ئەم شڵەژانە گەورەیە چییە پێم بڵێن. هاواری دەگەیشتە هەموو ئامادەبوانی ڤێستیڤاڵەکە. کەس هیچی نەدەزانی بەڵام نارەزایی تادەهات کڵپەی دەسەند و مەترسی سەرتابلۆ و پەیکەرەکانیش زیاتر دەکەوتنە بەرچاوان یەکێ لە هاوڕێکانی وەک ئەسپی خەیاڵی حیکایەتە کۆنەکان بە دڵسۆزیەکەوە خۆی گەیاندە عەلی چرپاندی بە گوێیدا. عەلی شڵەژا. . . وەک شڵەژانی درەختێک لەبەر هێرشی ڕەشەبایەکی بەهێزدا. هاوڕێیەکەی هاواری دەکرد عەلی مەشڵەژێ بەڵام کارەساتێک روبەڕووی تۆ بۆتەوە مەشڵەژێ عەلی تۆ لە هەموو کەس زیاتر دەبێ لە هونەری بێدەنگی تێ بگەیت کاتێک بێدەنگی بۆ خۆی قسەیە لە ئۆقرەی چاوەڕوانیدا. لە پشت هاوڕێکەی عەلییەوە

دەنگە دەنگەکە ڕوبەڕوی عەلی هاژەی دەکرد و لە عەلی نزیک دەبووە. دەیانگوت هێی تۆ ئەی هونەرمەندی بەتوانا دەتەوێ چی بڵێیت. بۆ مێژووی برینداری ئەم شارە بریندارتر دەکەیت! بۆ؟ دەیانگوت ئایا نیگای کچێکی باڵابەرز ئەوەندە دەهێنێ لە مێژووی برینی ئەم شارە پیرۆزتر بێ لات. دەیانگوت تابلۆکانی تۆ لە تابلۆی دەستی ئەو فڕۆکەوانانە دەچێ کە ئەم شارەیان ژەهر باران کرد. عەلی ڕومەتەکانی سوور هەڵگەڕابوون زمانی چوبووە کلیلە. هەموو جەستەی وەک شۆڕەبی دەلەرزی. ئامادەبوانی ناو هۆڵەکە ببون بە دوو بەشەوە. ئەو بەشەی هەڕەشەو گومانیان لە دڵسۆزی عەلی دەکرد تووڕەبوون وەک تووڕەبوونی کڵپەی ئاگرێک کاتێک کە ژنێکی نیگەران مردنی پێ چاکترە لەوەی ژێردەستی بگاتە ئاستی لێدان و دارکاری و تف لە ناوچەوان کردنی. بەشەکەی تریان بەهەموو توانایان پاڵیان دەنا بە خەڵکە تورەکەوە و دەیانگوت ناکرێ کەسێ نەزانێ چی دەڵێ و هونەرمەندێک بەناڕەوا تاوانبار بکەن و خەڵکی تر سەری بەڵێی بۆ بلەقێنن. دەیانگوت ئەم هونەرمەندە دەبێ بە شوێن گێڕانەوەی ژیانەوە بێت لەم شارەدا نەک دووبارە ژەهر خواردو کردنەوەی

شارەکە بە خەفەت. عەلی دەیگوت بمبەخشن خەڵکینە با منیش تێبگەم. ئاخر منیش وەک ئێوە عەوداڵی زانینی ئەو ڕاستییانەم کە کەس نازانێ لای کێیە منیش بەشوێن دۆزینەوەی خۆم و هەموو ئەندامە ونبووەکانی خێزانەکەمدا دەگەڕێم. ئاخر ئازادی کاتێ مانای هەیە کە هەر کەسە بەشێوەیەکی تایبەتی خۆی بەشوێن دۆزینەوەی کلیلی نهێنیەکانی خۆی و هەموو شتە پیرۆزەکانیدا بگەڕێت. یەک دوو کەس پەلی عەلیان ڕاکێشا بەرەو ئەودیوی هۆڵەکە بەڕاڕەوێکدا تێ دەپەڕین بەناو سەدان میوانی پێشانگاکەدا ڕەت دەبوون، ئەو ڕاڕەوەی عەلیان تێدا ڕاپێچ کرد دەچووە سەر هۆڵێکی ڕوناکی گەورەوە. کە پێشەنگایەکی ڕازاوەبوو بە سەدان تابلۆی جۆراوجۆر. کە هەر لەم یادەدا بۆ هونەرمەندێکی شێوەکاری تر ئامادەکرابوو. لەوێدا هەندێ دەنگی ناچیزە و ڕق ئەستور ناڕەزاییان دەردەبڕی، گوایە ئەم دوو هونەرمەندە دەیانەوێت کارەساتی هەڵەبجە لەکەدار بکەن بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی تەنها دایکێک و چیرۆکی دابڕانی دووکەسی تامەزرۆ بەیەکتر. عەلی چووە پێشەوە سەیری تابلۆکانی دەکرد بە وردی دەیڕوانی دەیویست زۆر بەخێرایی لەمەبەستی هۆردوی

پـەلاماردەران تێبگـات. سـەرەتا لەبـەردەم تابلۆیەکـدا ڕاوەستا. تابلۆکە وێنەی شارێکی وێران بوو هەموو ماڵەکان دەرگاو پەنجەرەکانیان کرابۆوەو باڵندەکان بە مردوویی هـات و چۆیـان پیـادا دەکـرد مرۆڤەکـان بە مردوویـــی دەهـــاتنە دەرەوەو دەچـــوونە ژوورەوە. بەتەنها دیواری خانوەکان نـەبێت کەبە گوڵی ڕەنگاو ڕەنـگ ڕازابوونـەوە هـەنگاوێکی تـری نـا تابلۆیــەک سـەرنجی ڕاکێـشا ژنێکـی بـەویقار بـە بەرگـی ڕێـک پۆشی ئێرانیەوە لەپاڵ گۆڕێکی بەکۆمەڵدا وەستابوو. دەستێکی بوبوو بە دیواری سووتاوی چەند ماڵێک و بـە گوڵـی ڕەنگـاو ڕەنـگ ڕازا بـووە و پیـاوێکیش لـە جۆری بالاّی خۆی بۆنی گوڵەکانی دەکرد، شـارەکەش لـەناو تـەمێکی سـووورباودا نغرۆبـوو. ژنە بە ویقـارە ڕەش پۆشـــەکە بەدەســـتەکەی تـــری تابلۆیەکـــی هـەڵگرتبوو تێیدا لـوتکەی دوو کێـوی مەزن لـە یەکتـر نزیـک دەبوونـەوە. عـەلی تێگەیـشت ئـەو حیکمەتـەی بیرکەوتەوە کە دەڵێ کێو بە کێو ناگات بەڵام ئادەم بە ئـادەم دەگـات. هـەر دیـاربوو ئـەو هونەرمەنـدەی ئـەم تابلۆیـەی دروسـت کردبـوو تێیـدا حیکمـەتی تـابلۆکەی پێچەوانــە کردبــۆوە تــابڵێن تێپەڕانــدنی لۆژیــک و موسـتەحیل ئەگەرێکـی نزیکـە. لـەویش تێپـەری لـەو

کاتــەدا گوێــی لــە تــرپەی دڵــی خــۆی دەبــوو، وەک دەهۆڵی ڕەشبەڵەک لێیدەدا. چووە بەردەم تابلۆیەکی زەردبـاووی چوارچێـوە زیـوین و تەماشـای قۆڵـی ژنێکـی گـەنجی دەکـرد تەنانـەت ڕیـشاڵە وردەکانـی سەردەسـتی و ڕەگـی بـاریکی پەنجـەکانی دیـاربوون ئەڵقەیەکی ئاڵتوونی کە دووماری زیوین بوون دەمیان خستبوە دەمـی یەکـەوە لەپەنجـەی دەسـتی ڕاسـتیدا بریـسک و هـوڕی بـوو. عـەلی هەسـتی دەکـرد ئـەو دەسـت و موسـتیلە ئاڵتونیـە دەناسـێتەوە بـەڵام تـەواو بیری نەدەکەوتەوە کەی و لە کویێ و هی کێ بووە. گـەڕا هـەموو تابلۆکـانی جـارێکی تـر بەسـەر کـردەوە نـــەناو و نـــەواژۆی کەســـی لـــەژێردا نەنوســـرابوو. سەرسـام بـوو وەک سەرسـامیی کۆترێک لەئاسـماندا باڵەکانی خەریک بن هەڵوەرێن. عەلی بەدوای نازناوی هونەرمەندەکـەدا دەگـەڕا. چـووە بـەردەم تابلۆیەکـی قەبـارە گەورەی ڕەنـگ خۆڵەمێشیی بـەدەیان میناتۆر نەخـشێنرابوو. لـەڕووی ئـەودیو تابلۆکـەوە چاوێکـی گـــەورە دەیڕوانـــی. ڕووی ژێـــرەوەی میناتۆرەکـــان بەگشتی هـەمان ئـەو چـاوەبوون تـاک و تـەرا نەبێـت قژێکی ڕەش دەکەوتنە سەر دوو برۆی پڕ و گەنجانە کـە نێـوان هـەردوو برۆکـە بـە چەشـنێکی هونـەری

بەیەک گەیشتبون بێ ئەوەی دیمەنێکی نا ئاسایی دەربخەن بە پێچەوانەوە چاوەکانیان گەشتر و فراوانتر دەردەکەوتن بە شێوەیەک بینەر بە ئاسانی دەیتوانی نیگاکانی هەرتابلۆیەک بەجیا بخوێنێتەوە کە هەر نیگایەک چیرۆکێک بوو لەو چیرۆکانەی حەزدەکەیت زوو بیبیستیو نهێنیەکەی بزانیت. عەلی سەرسام دەیڕوانی هەناسەکانی خۆی وەستاند. بڕوای بەچاوەکانی خۆی نەدەکرد کەوتە هەڵگڵۆفتنی چاوەکانی. ئیتر چاوەکانی کردەوە و تەواو دڵنیابووکە چاوەکانی نایخەڵەتێنن ئەوەی بەڕاستی دەیبینێ هەستێکە خەریکە چەکەرە بکات تا دەهات زیاتر ڕادەما، ڕامانێک وەک ئەوەی لە هۆڵەکەدا بەتەنها خۆی و تابلۆکان هەبن و تابلۆکان بیانەوێ دان بە ڕاستیەکانی خۆیاندا بنێن. خەریک بوو نهێنی خەیاڵی هونەرمەندەکە بدرکێنن، لەناکاو تەنها تریفەیەک سەری هەڵدا. بوو بە دوان و زیاتر و پاشان بە بیرەوەریی ناو هۆڵەکە خەیاڵی ڕۆشن بووەوە، بەتایبەتی سیما غەمگین و چاوەڕوانەکەی کچەباڵابەرزە قژدرێژەکە ئیتر کەوتە کردنەوەی کۆدە نائاشکراکان. چاوەکانی خۆی ناسییەوە چۆنیەتی برۆکانی و نیگا غەمگینیەکەی ئەوەی لە ڕۆژانی

بەسەرچووی ناو هۆڵەکەدا بیرکەوتەوە ، موستیلە سحریەکەی ناسیەوە. هەروەها پەنجە ناسک و سپی یەکانیشی، ئەوەی بە خەیاڵیش بیری لێ نەدەکردەوە بوو بە ڕاستی بەڵام ڕاستیەک کە مرۆڤ بە ئاسانی ناتوانێ پێ لەحەقیقەتی بوونیدا بنێ، لەبەر دووری ئەگەری ڕوودانی ئەو ڕاستییانە لەبەر خۆیەوە گوتی چاوەکانی من لە ناو چاوی ئەودا هیچ شتێکی نەهێشت گومان وردووخاش نەکا و تەواو نەم گەیێنێتە دوورگەی دڵنیایی کە بەهەزاران ڕایەڵەی نیگەرانی تەنرا بوو. هەموو گیانی جارێکیتر نیشتەوە سەر ئارەقە. هێشتا خەڵکەکە تەنگەتاو بوون. پەیتا پەیتا ڕۆژنامەنوسەکان پرسیاری کاڵ و کرچیان لێ دەکرد و ئەم وەڵامی نە دەدانەوە. سەری لەخۆی سووڕما بۆ یەکەم جار بوو دوای ئەو هەموو نیگەرانیەی ناو هۆڵەکە هەست بە دڵنیایی بکات. دڵنیاییەک کە جۆرە لەزەتێکی هەیە تەنانەت کەس قودرەتی ئەوەی نیە بیکات بە تابلۆ! خۆی لە خەڵکەکە ڕاپسکان. بەشوێن ئەو هونەرمەندە دادەگەڕا. ڕۆژنامەنوسەکان بەشوێنیدا ڕایان دەکرد بەدەم ڕاکردنەوە دەیان پرسی ئایا گەڕان بەشوێن کەسێکدا کە نەزانی کێیە پێویست بەم هەموو شەکەتی و

ماندووبوونە دەکات؟ پێیان دەگووت عەلی گەڕان بە شوێن کارەساتی شارێک و گەڕان بە شوێن ئەو هونەرمەندەدا کامیان لە کامیان گرنگترە؟ دەیانگوت پەیوەندی لە نێوان خۆشەویستی شارێک و خۆشەویستی دوو ئەویندارا چییە؟ دەیان پرسی نهێنی ئەو نیگایانە چین کە لەتابلۆکانی تۆو ئەو هونەرمەندەدا تێکەڵ بەیەک بوون؟عەلی لە وەڵامی ئەواندا دەیگوت: ئەم پرسیارانە زۆر سادەن، هەموومان بەشوێن نهێنی ئەو سەرە داوانەدا دەگەڕێین کەلە گڵۆڵە ئاڵۆسکاوەکانەوە پێچراون. دەبێت مرۆڤ سەرەتا خۆی بدۆزێتەوە ئینجا بەشوێن چواردەورەکەیدا بگەڕێت ئاخر گەڕان بەشوێن نهێنی خۆشەویستی کەسێک یاخود نهێنی خۆشەویستی شارێک جیاوازیەکەی لەچیدایە، لەڕاستیدا هەمووتان دەبێت بەشوێن ئەو وەڵامانەدا بگەڕێن، تا پەی بەو حەقیقەتە بەرن و هەرچی زووە وەکو من بیدۆزنەوە!

●●●

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١. مەرگی بەختەوەری، شانۆیی شیعری، ١٩٨٤
٢. دەروازەی سێیەمی مێژوو، چیرۆکەشیعر، ١٩٨٥
٣. تراژیدیای مەرگی پاکیزە، چیرۆکەشیعر، ١٩٨٦

٤. سەمفۆنیای خوێن، چیرۆکەشیعر، ١٩٨٧
٥. لە زیندانی فاشییەکاندا، قەسیدەی درێژ، ١٩٨٨
٦. ئەنفال، قەسیدەی درێژ، ١٩٨٩

٧. رووانین، قەسیدەی درێژ، ١٩٩٧
٨. نامەکراوەکانی تاراوگە، دیوانە شیعر، ٢٠٠٠
٩. پەیکەرێک لە وەهم، کتێبی شیعر، ٢٠٠٢

١٠. کەڵەگا، قەسیدەی درێژ، ٢٠٠٥
١١. گۆڕ غەریب، ڕۆمان، ٢٠٠٧
١٢. شاعیرێ وێنە دەکێشێ، کتێبی شیعر، ٢٠٠٩

١٣. ژنێ لەوپەڕی جوانیدا، کۆبەرهەم، ٢٠١٠
١٤. نیشتمان پڕە لە میلۆدی حەسرەت، کتێبی شیعر، ٢٠١١
١٥. فرمێسکی بەفر، ڕۆمان، ٢٠١٢